مەكسيك، دەستكەوتيان لەساڵی ١٩٥٠تەنها ١٤٪بوو. ئەو ڕێژەیەش دابەزیوە بۆ ١١ ٪ لە داهاتی نەتەوە لە ساڵی 1969[10]. هەروەها پشکی هەژارترین کەرت لەو کۆمەڵە ناوبراوە کە (٢٠٪دانیشتوانن لە ڕێژەی ٦٪وە دابەزیووە بۆ ٤٪ لە هەمان کاتدا.

بارودۆخی بەڕازیلیش جیاواز نەبووە، لە کاتێکدا لە دەیەی حەوتەمدا گەشەیەکی ساڵانەی بەدەست هێناوە، کە بەرهەمی نەتەوەیی ڕاستەقینەی تاکە کەس گەیشتە٢,٥٪ ، هەژارترین کۆمەڵیان کە(٤٠٪ی دانیشوان دەبن) تەنها١٠٪ی دەست کەوتووە لە بەرهەمی داهاتی نەتەوە لە ساڵی ١٩٦٠، کە کەمتر بۆتەوە بۆ ٨٪ لە ساڵی ١٩٧٠ بەڵام توێژی زۆر دەوڵەمەند (کە تەنها ٥٪ ی دانیشتوانن)، بەشیان بەرز بووەتەوە لە٢٩٪بۆ ٣٨٪لە هەمان کاتی پێشودا[11] . بە پێی پێوەری سەرجەمی بەرهەمی نەتەوەیی ئەو وڵاتە، کەمایەتیە دەوڵەمەندەکەی دەستێکی باشیان وەشاندووە، بەڵام٤٠٪ی دانیشتوان لە ژێر ئاستی هەژاریەوە دەژین)[12] . واتە ناوەندی داهاتی تاکە کەس ساڵانە لە ٧٥دۆلار تێنەپەڕیووە ، بەشی توێژی زۆر هەژار(کە ٤٠٪ی دانیشتوانن) لە ٦٪ وە دابەزیوە بۆ ٤٪لە داهاتی نەتەوە. [13] هەروەها (مەکنەمارە) دەگاتە ئەوەی کە بڵێ: (ئەو نمونانەی باسمان کردن هەموو وڵاتەکانی جیهانی سێ بەگشتی ناگرێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لێکۆڵینەوەیەکی نوێ، لەسەر جۆرەکانی دابەشکردنی داهات، لە زیاتر لە ٤٠ وڵات لە وڵاتانی تازەپێگەیشتوو دەڵێت: کۆمەڵی زۆر دەوڵەمەند کە (٢٠٪ ی دانیشتوانن) ناوەندەکەی گەیشتۆتە ٥٦٪ داهاتی نەتەوە، لە سەرەتای دەیەی یەکەمی

---

[10] Mc Namara .Op.Cit.pp,103
[9] Op.Cit.
[10] Mc Namara .Op.Cit.pp,103
[11] Op.cit.
[12] Op.Cit.
[13] Op.Cit.

سەرژمێریەکان ناتوانن وەسفی بکەن ..ئەو راستیەش کە چەنوچونی تێدا نیە ئەمەیە:لەراستیدا بەدخۆراکیی و نەخۆشییو نەخوێندەوارییو بێکاریی باڵدەکێشێ بەسەر ئەو کۆمەڵە گەورە ئادەمیزادەدا ، کە لەژێر باری گرانی هەژاریدا دەناڵێنن ،بەشێوەیەك کە ناتوانین هیچ وەسفێکی بکەین بە جگە لە هێرشێکی بەردەوامی بێڕەحمیی دژی کەرامەتی ئادەمیزاد [8]

مەکنەمارا لەسەری دەڕوا و دەڵێت: (لەراستیدا زۆر لە گەلان ناتوانن تێکڕای گەشەکردنی (٦٪)بەدەست بهێنن، کە دەیەی دووەمی پەرەپێدان دیاریکردووە ( ١٩٨٠-١٩٨٠)،ئەوەشی گەڕاندەوە بۆ گەورەبوونی گیروگرفتی قەرزەکان و ، ئەو کۆسپانەی رێگا دەگرن ، لە چوونی بەرهەمی وڵاتە تازەپێگەسشتووەکان بۆ دەوڵەتە پیشەسازیەکان ، هەتا ئەگەر گریمان تێکڕای گەشەکردنی پیشنیار بۆکراو بەدەست بیت لەسالی ١٩٨٠ز،ئایا ئەوە دەستەبەری بەرزبوونەوەی ئاستی ژیان بەشێوەیەکی هەستپێکراو ،بۆ زۆربەی دانیشتوانی جیهانی دواکەوتوو دەکات..؟

وەلامی ئاشکرا ، نەخێرە، چونکە تیکڕا بەرزەکانی گەشەکردن کە دەیەی حەوتەمی سەدە دیویەتی ، بەرهەمەکەی بەهیچ ئەندازەیەکی هەستپێکراو نەگەیشتە هەژارانی وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان [9]. هەروەها مەکنەمارا بەردەوامە لە روونکردنەوەکەیداو دەڵێت:( داهاتی مامناوەندیی راستەقینەی تاکەکەس لە مەکسیك لەماوەی (١٩٥٠-١٩٦٢)بەرزیەکی تا ئاستی ٣٪ بەدەستهێناوە. بەلام توێژی زۆری دەوڵەمەندی کۆمەڵگا،کە ١٠٪یە نیوەی داهاتی نەتەوەیان بۆ خۆیان پچڕیووە هەر لەسەرەتای ماوەکەوە، ئینجا پشکیان تا کۆتایی ماوەکە بەرز بوەتەوەوە بۆ٤٩٪و٥١٪، بەلام کۆمەلانی زۆر هەژار کە ٤٠٪ی دانیشتوان دەبن لە

---

[8] Robert ,S . McNamara 1973.One hundred countrhes, two bhllhon people ,praeger publishers Inc .New-York,p,8.
[9] Op.Cit.

مەکسیك، دەستکەوتیان لە ساڵی ١٩٥٠تەنها ١٤٪بوو. ئەو ڕێژەیەش دابەزیوە بۆ ١١ ٪ لە داهاتی نەتەوە لە ساڵی 1969[10]. هەروەها پشکی هەژارترین کەرت لەو کۆمەڵە ناوبراوە کە (٢٠٪دانیشتوانن لە ڕێژەی ٦٪وە دابەزیووە بۆ ٤٪ لە هەمان کاتدا.

بارودۆخی بەڕازیلیش جیاواز نەبووە، لە کاتێکدا لە دەیەی حەوتەمدا گەشەیەکی ساڵانەی بەدەست هێناوە، کە بەرهەمی نەتەوەیی ڕاستەقینەی تاکە کەس گەیشتە٢,٥٪ ، هەژارترین کۆمەڵیان کە(٤٠٪ی دانیشوان دەبن) تەنها١٠٪ی دەست کەوتووە لە بەرهەمی داهاتی نەتەوە لە ساڵی ١٩٦٠، کە کەمتر بۆتەوە بۆ ٨٪ لە ساڵی ١٩٧٠ بەڵام توێژی زۆر دەوڵەمەند (کە تەنها ٥٪ ی دانیشتوانن)، بەشیان بەرز بووەتەوە لە٢٩٪بۆ ٣٨٪لە هەمان کاتی پێشودا[11] . بە پێی پێوەری سەرجەمی بەرهەمی نەتەوەیی ئەو وڵاتە، کەمایەتیە دەوڵەمەندەکەی دەستێکی باشیان وەشاندووە، بەڵام٤٠٪ی دانیشتوان لە ژێر ئاستی هەژاریەوە دەژین)[12] . واتە ناوەندی داهاتی تاکە کەس ساڵانە لە ٧٥دۆلار تێنەپەڕیووە ، بەشی توێژی زۆر هەژار(کە ٤٠٪ی دانیشتوانن) لە ٦٪ وە دابەزیوە بۆ ٤٪لە داهاتی نەتەوە. [13] هەروەها (مەکنەمارە) دەگاتە ئەوەی کە بڵێ: (ئەو نمونانەی باسمان کردن هەموو وڵاتەکانی جیهانی سێ بەگشتی ناگرێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لێکۆڵینەوەیەکی نوێ، لەسەر جۆرەکانی دابەشکردنی داهات، لە زیاتر لە ٤٠ وڵات لە وڵاتانی تازەپێگەیشتوو دەڵێت: کۆمەڵی زۆر دەوڵەمەند کە (٢٠٪ ی دانیشتوانن) ناوەندەکەی گەیشتۆتە ٥٦٪ داهاتی نەتەوە، لە سەرەتای دەیەی یەکەمی

---

(10) Mc Namara .Op.Cit.pp,103
(9) Op.Cit.
(10) Mc Namara .Op.Cit.pp,103
(11) Op.cit.
(12) Op.Cit.
(13) Op.Cit.

سەرژمێریەکان ناتوانن وەسفی بکەن ..ئەو راستیەش کە چەنوچونی تێدا نیە ئەمەیە:لەراستیدا بەدخۆراکیی و نەخۆشیی‌و نەخوێندەواریی‌و بێکاریی باڵدەکێشێ بەسەر ئەو کۆمەڵە گەورە ئادەمیزادەدا ، کە لەژێر باری گرانی هەژاریدا دەناڵێنن ،بەشێوەیەك کە ناتوانین هیچ وەسفێکی بکەین بە جگە لە هێرشێکی بەردەوامی بێڕەحمیی دژی کەرامەتی ئادەمیزاد [8]

مەکنەمارا لەسەری دەڕوا و دەڵێت: (لەراستیدا زۆر لە گەلان ناتوانن تێکڕای گەشەکردنی (٦٪)بەدەست بهێنن، کە دەیەی دووەمی پەرەپێدان دیاریکردووە ( ١٩٨٠-١٩٨٠)،ئەوەشی گەڕاندەوە بۆ گەورەبوونی گیروگرفتی قەرزەکان و ، ئەو کۆسپانەی رێگا دەگرن ، لە چوونی بەرهەمی وڵاتە تازەپێگەسشتووەکان بۆ دەوڵەتە پیشەسازیەکان ، هەتا ئەگەر گریمان تێکڕای گەشەکردنی پیشنیار بۆکراو بەدەست بیت لەسالی ١٩٨٠ز،ئایا ئەوە دەستەبەری بەرزبوونەوەی ئاستی ژیان بەشێوەیەکی هەستپیکراو ،بۆ زۆربەی دانیشتوانی جیهانی دواکەوتوو دەکات..؟

وەلامی ئاشکرا ، نەخیرە، چونکە تیکڕا بەرزەکانی گەشەکردن کە دەیەی حەوتەمی سەدە دیویەتی ، بەرهەمەکەی بەهیچ ئەندازەیەکی هەستپێکراو نەگەیشتە هەژارانی وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان [9]. هەروەها مەکنەمارا بەردەوامە لە روونکردنەوەکەیداو دەڵێت:( داهاتی مامناوەندیی راستەقینەی تاکەکەس لە مەکسیك لەماوەی (١٩٥٠-١٩٦٢)بەرزیەکی تا ئاستی ٣٪ بەدەستهێناوە. بەڵام توێژی زۆری دەوڵەمەندی کۆمەڵگا،کە ١٠٪یە نیوەی داهاتی نەتەوەیان بۆ خۆیان پچڕیووە هەر لەسەرەتای ماوەکەوە، ئینجا پشکیان تا کۆتایی ماوەکە بەرز بوەتەوەوە بۆ٤٩٪و٥١٪، بەڵام کۆمەڵانی زۆر هەژار کە ٤٠٪ی دانیشتوان دەبن لە

---

[8] Robert ,S . McNamara 1973.One hundred countrhes, two bhllhon people ,praeger publishers Inc .New-York,p,8.
[9] Op.Cit.

ناوخۆدا ، بەڵکو لە ئەنجامی دەستێوەردانی دەرەکیی لە کۆمەڵگا زۆر پێشکەوتووەکانەوە دێت ،چونکە داگیرکردن _چ بەراست و چ بەناو _ڕاچڵەکاندنێکی وای داوە بە کۆمەڵگا تەقلیدیەکان بیرو هەستی وای تێدا دروست کردن ،کە هێنەری پرۆسەی بنیادی نوێیە بۆ کومەڵگای تەقلیدی کە ژیارە کۆنەکانی دوایخستووە.

بیردۆزەی ڕۆستۆ لە بواری پەرەپێدانی ئابوریدا ، جەخت لسەر بیردۆزەکانی ئۆجیس کۆنت و دۆرکایم و داروین و فرۆیدو جێمس فریزەر ، لە بواری خوێندنەوە کۆمەڵایەتی و فەلسەفی و دەروونیەکاندا دەکاتەوە ، کە خۆرئاوای سەرمایەداریی دەکاتە تەوەرێك لەخولگەکەیدا کۆمەڵگاکانی تر دەخولێنەوەو ، پاڵدەنێت بەپرۆسەی بەخۆرئاوایی کردنەوە بۆکۆتاییە مەنتقیەکانی، ئەمەش واتا چاندنی چەمك و بەهاو بیردۆزە خۆرئاوایەکان ،هاوڕێ لەگەڵ تاریکیە ئابووریی و ڕامیاریی و کۆمەڵایەتیی و ڕەفتاریەکانەوە ، لە نێوان کۆمەڵگا هەژارەکاندا ، بەهەموو ئەنجامەکانی ئەو بەهایانەوە کە قوڵکردنەوەی، هەست بە شکستی دەروونیو بێ ئومێدی و پاشکۆیەتیە ، بەرامبەر بەمەش _ لەلایەن جیهانی پێشکەوتووەوە _ هەست کردنە بەسەرکەوتویی و خۆبەگەورە زانین و مامۆستایی ، ئینجا دوای ئەوە درشمی(گۆڕان لە پێناوی گەیشتنەوە بە کاروانی ژیاردا ) لە نیوان چینی رۆشنبیردا لە وڵاتەکانی جیهانی سێدا، لە ناویاندا جیهانی ئیسلامیمان سەرهەڵدەدات.

دکتۆر ئیسماعیل سەبری عەبدولا[(17)] ئەو دیاردەیەی بەمشێوەیە دەربڕیووە : (لە کۆتاییدا پاشکۆێتی بۆ سەرمایەداریی –جیهانیی، بە پاشکۆێتی ژیاریی تەواودەبێت ، خۆرئاوای سەرمایەداریی منارەی زانست و تەکنۆلۆژیاو هونەرو

---

(17) سەرچاوەی پێشوو ل .٢٢٥-٢٣٥

پەرەپێدانەوە(١٩٦٠-١٩٧٠). ئەمە لە کاتێکدا کۆمەڵی زۆر هەژار(٦٠٪ ی دانیشتوانن) بەشیان تەنها٢٦٪ بەرکەوتوو[14]

پوختەی قسەکانی مەکنەمارە ئەوەیە کە ،بەڵگەکانی ئاماژە بۆ ئەوە دەکا ئەو کەموکورتیە گەورەیەی لە دابەش کردنی نەتەوەدا هەیە، بەردەوام نابێت و بەس، بەڵکو لەوانەیە لە زۆر وڵاتدا خراپتر ببێت.

## بەخۆرئاوایی بوون لە دوو توێی پەرەپێداندا

زانایانی پەرەپێدان لە ئابووریناسانی خۆرئاوا، بەوەوە نەوەستاون کە پەرەپێدان لە دیدی تایبەتی خۆیانەوە،کە هەڵگۆڕراوی خوێندنەوەی گەشەکردنی ئابووریی کۆمەڵگای ئەوروپایە، لە سەردەمی شۆڕشی پیشەسازیەوە بخەنەڕوو، بەڵکو دەستیانکرد بە گشتگیرکردنی زۆر زیاد، کە ئەو بیردۆزانە بکەن بە قاڵبێك بۆ ناردنی بۆ وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان، بۆ ئەوەی هەوڵی گەشەپێدانی خۆیانی لەسەر بنیادبنێن و، ئاواتەکانی خۆیان بەرەو پێشکەوتن و خۆشگوزەرانیی ئی دەست بخەن . ئەمەش ئەوە بو کە (وۆلت ڕۆستۆ) کردی، لە کاتێکدا قۆناغەکانی گەشەکردنی مێژووی سەرمایەداریی ئەوروپای دابڕی و[15]، بەشێوەی بیردۆزەیەك پێشکەشی کردوو، لە ناو ئەوانەدا بڵاوبویەوە کەخەریکی کاری پەرەپێدانن لە وڵاتە تازەپیگەیشتووەکاندا. ڕۆستۆ دەیگوت -ئەمەش ئەوەیە کەبەلامانەوە گرنگە لە شوێنکەوتەی پرۆسەی بەخۆرئاوایی بوون [16] . لەڕاستیدا قۆناغی (بارودۆخی ئامادە بۆ ڕابوون) لەکۆمەڵگاکانی تردا نیە ( جگە لە ئەورووپیەکان)، ڕاستەوخۆ و لە

---

[14] Op.Cit.pp.103-104
[15] W.W.Rostow ,the stages of economic growth , Op.Cit pp. Cit, 4-11
[16] سماعیل صبری عبدالله ،نحو نظام اقتصادی عالمی جدید،مصدر سابق ،ص ١٣٢

ناوخۆدا ، بەڵکو لە ئەنجامی دەستێوەردانی دەرەکیی لە کۆمەڵگا زۆر پێشکەوتووەکانەوە دێت ،چونکە داگیرکردن _ چ بەراست و چ بەناو _ ڕاچڵەکاندنێکی وای داوە بە کۆمەڵگا تەقلیدیەکان بیرو هەستی وای تێدا دروست کردن ،کە هێنەری پرۆسەی بنیادی نوێیە بۆ کومەڵگای تەقلیدی کە ژیارە کۆنەکانی دوایخستووە.

بیردۆزەی ڕۆستۆ لە بواری پەرەپێدانی ئابوریدا ، جەخت لسەر بیردۆزەکانی ئۆجیس کۆنت و دۆرکایم و داروین و فرۆیدو جێمس فریزەر ، لە بواری خوێندنەوە کۆمەڵایەتی و فەلسەفی و دەروونیەکاندا دەکاتەوە ، کە خۆرئاوای سەرمایەداریی دەکاتە تەوەرێك لەخولگەکەیدا کۆمەڵگاکانی تر دەخولێنەوەو ، پاڵدەنێت بەپرۆسەی بەخۆرئاوایی کردنەوە بۆکۆتاییە مەنتقیەکانی، ئەمەش واتا چاندنی چەمك و بەهاو بیردۆزە خۆرئاوایەکان ،هاوڕێ لەگەڵ تاریکیە ئابووریی و ڕامیاریی و کۆمەلآیەتیی و رەفتاریەکانەوە ، لە نێوان کۆمەڵگا هەژارەکاندا ، بەهەموو ئەنجامەکانی ئەو بەهایانەوە کە قوڵکردنەوەی، هەست بە شکستی دەرونیو بێ ئومێدی و پاشکۆیەتیە ، بەرامبەر بەمەش _ لەلایەن جیهانی پێشکەوتووەوە _ هەست کردنە بەسەرکەوتویی و خۆبەگەورە زانین و مامۆستایی ، ئینجا دوای ئەوە درشمی(گۆڕان لە پێناوی گەیشتنەوە بە کاروانی ژیاردا ) لە نیوان چینی رۆشنبیردا لە وڵاتەکانی جیهانی سێدا، لە ناویاندا جیهانی ئیسلامیمان سەرهەڵدەدات.

دکتۆر ئیسماعیل سەبری عەبدولا[17] ئەو دیاردەیەی بەمشێوەیە دەربڕیووە : (لە کۆتاییدا پاشکۆیتی بۆ سەرمایەداریی –جیهانیی، بە پاشکۆیتی ژیاریی تەواودەبێت ، خۆرئاوای سەرمایەداریی منارەی زانست و تەکنۆلۆژیاو هونەرو

---

[17] سەرچاوەی پێشوو ل .٢٢٠-٢٢٣

پەرەپێدانەوە(١٩٦٠-١٩٧٠). ئەمە لە کاتێکدا کۆمەڵی زۆر هەژار(٦٠٪ ی دانیشتوانن) بەشیان تەنها ٢٦٪ بەرکەوتوو[14]
پوختەی قسەکانی مەکنەمارە ئەوەیە کە ،بەڵگەکانی ئاماژە بۆ ئەوە دەکا ئەو کەموکورتیە گەورەیەی لە دابەش کردنی نەتەوەدا هەیە، بەردەوام نابێت و بەس، بەڵکو لەوانەیە لە زۆر وڵاتدا خراپتر ببێت.

## بەخۆرئاوایی بوون لە دوو توێی پەرەپێداندا

زانایانی پەرەپێدان لە ئابووریناسانی خۆرئاوا، بەوەوە نەوەستاون کە پەرەپێدان لە دیدی تایبەتی خۆیانەوە،کە هەڵگۆزراوی خوێندنەوەی گەشەکردنی ئابووریی کۆمەڵگای ئەوروپایە، لە سەردەمی شۆڕشی پیشەسازیەوە بخەنەڕوو، بەڵکو دەستیانکرد بە گشتگیرکردنی زۆر زیاد، کە ئەو بیردۆزانە بکەن بە قاڵبێك بۆ ناردنی بۆ وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان، بۆ ئەوەی هەوڵی گەشەپێدانی خۆیانی لەسەر بنیادبنێن و، ئاواتەکانی خۆیان بەرەو پێشکەوتن و خۆشگوزەرانیی لێدەست بخەن . ئەمەش ئەوە بو کە (ووڵت ڕۆستۆ) کردی، لە کاتێکدا قۆناغەکانی گەشەکردنی مێژووی سەرمایەداریی ئەوروپای دابڕی و[15]، بەشێوەی بیردۆزەیەك پێشکەشی کردوو، لە ناو ئەوانەدا بلاوبویەوە کەخەریکی کاری پەرەپێدانن لە وڵاتە تازەپیگەیشتووەکاندا. ڕۆستۆ دەیگوت -ئەمەش ئەوەیە کەبەلامانەوە گرنگە لە شوێنکەوتەی پرۆسەی بەخۆرئاوایی بوون [16] . لەڕاستیدا قۆناغی (بارودۆخی ئامادە بۆ ڕابوون) لەکۆمەڵگاکانی تردا نیە ( جگە لە ئەوروپیەکان)، ڕاستەوخۆ و لە

---

[14] Op.Cit.pp.103-104
[15] W.W.Rostow ,the stages of economic growth , Op.Cit pp. Cit, 4-11
[16] سماعیل صبری عبدالله ،نحو نظام اقتصادی عالمی جدید،مصدر سابق ،ص ١٣٢

گاڵتەپێکردنەکانی (گاڵبرێت)و سڵکردنەوەکانی (تەنبرگن) ئابووریناسی بەناوبانگی هۆڵەندا ،لەبارەی شێوازی پەرەپێدانی سەرمایەداریەوە لە وڵاتانی تازەپێگەیشتوودا.

گالبرێت کاتێ ئاماژەی بە بابەتی هاوچەرخێتی رەمزیی Symbolic Modernization کردووە ، بەشێوازێك بووە کە خاڵی نییە لە گالتەپێکردن ، کاتێ وتوویەتی: (نیشانە دیارەکانی دەوڵەتی نەتەوەیی –واتە لە جیهانی سێدا– تێناپەڕێت لە : فرۆکەخانەیەك گلۆپەکانی بدرەوشێتەوە ، پایتەختێك شەقامی قیرتاووشۆستەبۆکراو بیبڕێت ، تەلاری جوان سەرنجی خەڵکی رابکێشێت ، سلکی دبلۆماسیو پرۆژەیەکی گەورەی وزەی کارەبای ئاوی، لەوانەشە ئاراستەی دامەزراندنی کارگەی ئاسن تواندنەوەش هەبێت ،هاوڕێ لەگەڵ ئەمانە هەموویدا کورتهێنانێکی راستەقینەی تەرازووی پێدان [21]

بەڵام راپۆرتێکی سەرەتایی کە بیست و دووکەس لە بیریارانی کیشوەرە جیاجیاکان بەسەرۆکایەتی (تەنبرگن) لە تەموزی ١٩٧٥ دایان ناوە ،لەسەر پیاچوونەوەی نەزمی جیهانیی کە تێیدا هاتووە : (بۆماندەرکەوتووە، لەم ساڵانەی دواییدا ، ئەو رێگایەی پێدا رۆیشتووین، لەگەڵ ئەوەی دەستکەوتی گەورەی تیا بەدیهاتووە، لە هەندێ بواردا بەرەو کارەسات و نائومێدی رۆیشتووە[22]

ئەوە بەکورتی نیشانەکانی پەرەپێدان و ئامانجەکانیو ئەنجامەکانی بوو،ئەوەی کە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان، لە کۆمەڵگای ئەورووپیەوە بۆیان ماوەتەوە ،ئەویش – وەکو دەردەکەوێت–تاقیکردنەوەیەك بوو، سەرکەوتنێکی رێژەیی لە هەندێ بواردا بەدەست هێناوە ،بەئەندازەی سەرنەکەوتنی لە بەدەمەوەچوونی ئاواتەکانی گەلانی

---

- J.K.Galbraith. Economic development Harvard U.press, 1964,p4 [21]

[22] سماعیل صبری عبدالله ،مصدر سابق ص١٠

زەوقی بەرزو پێشکەوتنە –مرۆڤی هاوچەرخ ئەوەیە بەجوانیی لاسایی خۆرئاوا بکاتەوە[18] .

دکتۆر ئیسماعیل لەو وەسفەدا زۆر نەڕۆیشتووە ، ئەوەی هەندێ لە گەورە بیریارانی عەرەب دەینووسن دەربارەی گرنگیی لاسایی کردنەوەی خۆرئاوا، لەوە زیاترە کە دکتۆر ئیسماعیل وتویەتی ، بۆ نمونە –دەبینین شێخی فەیلەسوفە هاوچەرخەکان لە میسر[19] بە ئاشکرا دەڵێت : ( ئەگەر دەستورێکی رامیاریی یا فێرکاریی یا چاکسازیی خێزان و کۆمەڵگامان بوێت، بەهەرشێوەیەك لە شێوەکان ، ئایا کام رێگا هەڵدەبژێرین ؟.. لەلای من تەنها یەك وەڵامی روون هەیە، نە ڕاڕایی تێدایەو نە ئاڵۆزیی..وەڵامی روون ئەوەیە بچینە ناو خۆرئاواوە ، لەرووی بیرکردنەوەمان وخوونەریتمان وئادابمان و بۆچوونمان بۆ دنیا . تاکە وەڵامی ئاشکرا ئەوەیە کە میسر ببێتە پارچەیەك لە ئەوروپا، وەکو ئیسماعیل (خدێوی ئیسماعیل) دەیویست. من لەساتەکانی خەوبینیندام، کاتێ خەودەبینم لەخەوما وڵاتەکەم گەیشتبێتە ئەو رۆژەی من حەزدەکەم پێی بگات ، من لەدەروونما وێنەی دەگرم لەکاتێکا لە چەپەوە بۆ راست وەکو ئەوان نووسیمان ، وەکو ئەوان دەخۆن خواردمان..بیربکەینەوە وەکو ئەوان بیردەکەنەوە ، بۆ دنیا بڕوانین وەکو ئەوان بۆیدەڕوانن.[20]

ئەوەی جێگای دڵگرانیە، بانگخوازانی شوێنکەوتووی کاروانی ژیاری خۆرئاوا ، ناپرسن نە لە پێداویست و تێچووی کاروانەکەو ، نەلەکاتی پێویستی، سەرەڕای ئەو ئاگادارکردنەوانەی کە مەکنەمارا بەزمانی ژمارە ئاگاداری کردنەوە ، هەروەها

---

[18]هەمات سەرچاوە ل .٦٦،

[19]هەمان سەرچاوە ل، ٢٢٠-٢٢٣،

[20]زکی نجیب محمود .شروق من الغرب ،دار الشروق القاهرة ،الطبعة الثنية ١٩٨٢ص٢١٨-٢١٩

گاڵتەپێکردنەکانی (گاڵبرێت)و سڵکردنەوەکانی (تەنبرگن) ئابووریناسی بەناوبانگی هۆڵەندا ،لەبارەی شێوازی پەرەپێدانی سەرمایەداریەوە لە وڵاتانی تازەپێگەیشتوودا.

گالبرێت کاتێ ئاماژەی بە بابەتی هاوچەرخێتی رەمزیی Symbolic Modernization کردووە ، بەشێوازێك بووە کە خاڵی نییە لە گالتەپێکردن ، کاتێ وتوویەتی: (نیشانە دیارەکانی دەوڵەتی نەتەوەیی –واتە لە جیهانی سێدا– تێناپەڕێت لە : فڕۆکەخانەیەك گلۆپەکانی بدرەوشێتەوە ، پایتەختێك شەقامی قیرتاووشۆستەبۆکراو بیبڕێت ، تەلاری جوان سەرنجی خەڵکی رابکێشێت ، سلکی دبلۆماسیو پڕۆژەیەکی گەورەی وزەی کارەبای ئاوی، لەوانەشە ئاراستەی دامەزراندنی کارگەی ئاسن تواندنەوەش هەبێت ،هاوڕێ لەگەڵ ئەمانە هەموویدا کورتهێنانێکی راستەقینەی تەرازوی پێدان [21]

بەڵام راپۆرتێکی سەرەتایی کە بیست و دووکەس لە بیریارانی کیشوەرە جیاجیاکان بەسەرۆکایەتی (تەنبرگن) لە تەموزی ۱۹۷۵ دایان ناوە ،لەسەر پیاچوونەوەی نەزمی جیهانیی کە تێیدا هاتووە : (بۆماندەرکەوتووە، لەم سالأنەی دواییدا ، ئەو رێگایەی پێدا رۆیشتووین، لەگەڵ ئەوەی دەستکەوتی گەورەی تیا بەدیهاتووە، لە هەندێ بواردا بەرەو کارەسات و نائومێدی رۆیشتووە[22]

ئەوە بەکورتی نیشانەکانی پەرەپێدان و ئامانجەکانیو ئەنجامەکانی بوو،ئەوەی کە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان، لە کۆمەڵگای ئەوروپییەوە بۆیان ماوەتەوە ،ئەویش – وەکو دەردەکەوێت–تاقیکردنەوەیەك بوو، سەرکەوتنێکی رێژەیی لە هەندێ بواردا بەدەست هێناوە ،بەئەندازەی سەرنەکەوتنی لە بەدەمەوەچوونی ئاواتەکانی گەلانی

---

- J.K.Galbraith. Economic development Harvard U.press, 1964,p4 [21]

[22]سماعیل صبری عبدالله ،مصدر سابق ص۱۰

زەوقی بەرزو پێشکەوتنە –مرۆڤی هاوچەرخ ئەوەیە بەجوانیی لاسایی خۆرئاوا بکاتەوە))[18] .

دکتۆر ئیسماعیل لەو وەسفەدا زۆر نەڕۆیشتووە ، ئەوەی هەندێ لە گەورە بیریارانی عەرەب دەینووسن دەربارەی گرنگیی لاسایی کردنەوەی خۆرئاوا، لەوە زیاترە کە دکتۆر ئیسماعیل وتویەتی ، بۆ نمونە –دەبینین شێخی فەیلەسوفە هاوچەرخەکان لە میسر))[19] بە ئاشکرا دەڵێت : ( ئەگەر دەستورێکی رامیاریی یا فێرکاریی یا چاکسازیی خێزان و کۆمەڵگامان بوێت، بەهەرشێوەیەك لە شێوەکان ، ئایا کام رێگا هەڵدەبژێرین ؟.. لەلای من تەنها یەك وەڵامی روون هەیە، نە ڕاڕایی تێدایەو نە ئالۆزیی..وەڵامی روون ئەوەیە بچینە ناو خۆرئاواوە ، لەرووی بیرکردنەوەمان وخوونەریتمان وئادابمان و بۆچوونمان بۆ دنیا . تاکە وەڵامی ئاشکرا ئەوەیە کە میسر ببێتە پارچەیەك لە ئەوروپا، وەکو ئیسماعیل (خدێوی ئیسماعیل) دەیویست. من لەساتەکانی خەوبینیندام، کاتێ خەودەبینم لەخەوما وڵاتەکەم گەیشتبێتە ئەو رۆژەی من حەزدەکەم پێی بگات ، من لەدەروونما وێنەی دەگرم لەکاتێکا لە چەپەوە بۆ راست وەکو ئەوان نووسیمان ، وەکو ئەوان دەخۆن خواردمان..بیربکەینەوە وەکو ئەوان بیردەکەنەوە ، بۆ دنیا بڕوانین وەکو ئەوان بۆیدەڕوانن.))[20]

ئەوەی جێگای دڵگرانیە، بانگخوازانی شوێنکەوتووی کاروانی ژیاری خۆرئاوا ، ناپرسن نە لە پێداویست و تێچووی کاروانەکەو ، نەلەکاتی پێویستی، سەرەڕای ئەو ئاگادارکردنەوانەی کە مەکنەمارا بەزمانی ژمارە ئاگاداری کردنەوە ، هەروەها

---

[18] هەمات سەرچاوە ل .٦٦٠

[19] هەمان سەرچاوە ل، ٢٢٠-٢٣٠

[20] زكي نجيب محمود .شروق من الغرب ،دار الشروق القاهرة ،الطبعة الثانية ١٩٨٢ص٢١٨-٢١٩

# شێوازی پەرەپێدانی سۆشیالیستیی

زاراوەی (حەتمی بوونی چارەسەری سۆشیالیستیی) لە ئەدەبی مارکسایەتیدا زۆر دووپات دەبێتەوە، مارکسیەکان مەبەستیان لەو زاراوەیە ئەوەیە : سەرمایەداریی کە تۆوی لەناوچوونی خۆی هەڵگرتووە ، ناتوانێ چارەسەری گیروگرفتی ئلبووریی مرۆڤ بکات. دوای ئەوە لەوەش لاوازترە کە بتوانێت ڕووبەڕوی گیروگرفتی هەژاریی ببێتەوە ، چونکە سەرمایەداریی لەسەر بنەمای چەوساندنەوەی مرۆڤ بۆ برای مرۆڤی دامەزراوە، ئەوەش خودی ئەوکارەیە کە سۆشیالیستی وەکو دەڵێن-هەول دەدات بۆ لەناوبردنی لێرەدا مەبەست لە سۆشیالیستی ئەوەیە کە(فردریك ئینگڵز)ناوی ناوە (سۆشیالیستیی زانستیی)، بۆ جیاکردنەوەی لە بزوتنەوە سۆشیالیستیە پێشووەکان لە ئەوروپا، ئەوانەی کە لە بانگەوازێکی چاکسازیی دەچوون.

(ئینگڵز)ڕەخنەی لەو بزوتنەوانە دەگرت، گوایا ئەوان تەنها ڕەخنەیان لە شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریی و ،ڕەتکردنەوەی لایەنە خراپەکانی و، تاوانبارکردنی چەوساندنەوەی بۆ چینی کرێکار کردووە ، بەڵام نەیانتوانیووە هۆی ئەو چەوساندنەوەیەو گەوهەرەکەی بزانن،نەیانتوانیووە بزانن (زێدە بایی) کە مارکس دۆزیەوە ، نهێنی ئەو چەوساندنەوەیە .ئینجا (ئینگڵز)کۆتایی قسەکەی بەوە دێنێ‌کە سۆشیالیزم بووە بە زانست، بەهۆی ئەو دوو دۆزینەوە گەورەیەوە کە مارکس دۆزیەوە ، واتە : ( بیرۆکەی شیکردنەوەی ماددی بۆ مێژوو ) لەگەڵ(زێدەبایی)•، ئەوە ئەو نهێنیەیە کە بەرهەمهێنانی سەرمایەداریی

---

• مەبەست لە زێدە بایی ئەوەیە کە سەرمایەدار ناتوانێ‌لە ڕێگای ئەو کەرەسەی بەرهەمهێنانەی کە هەیەتی داهات بەدەست بێنێ ،بەلکو دەبێ بەهۆی کارەوە بێت ،ئینجا لەبەر ئەوەی کار توخمی سەرەکیی کە شمەك بەرهەم دەهێنێ بەهاوکاریی کەرەسەکانی

هەژاردا . ئائەمەشە یەکەم بەربەرەکانی کە روویکردە ئوممەی ئیسلامیی ، کە قورساییەکی زۆری هەیە لە نێوان ولآتانی جیهانی سێدا.

بەلآم روویەکیتری ئەو بەربەرەکانیە ئەوەیە کە پێی دەڵێن:رێگای پەرەپێدانی شۆسیالیستیی ، کە وەکو بەدیلێکی حەتمی بۆ رێبازی سەرمایەداریی خۆرئاوا خۆی خستەروو.

# شێوازی پەرەپێدانی سۆشیالیستیی

زاراوەی (حەتمی بوونی چارەسەری سۆشیالیستیی) لە ئەدەبی مارکسایەتیدا زۆر دووپات دەبێتەوە، مارکسیەکان مەبەستیان لەو زاراوەیە ئەوەیە : سەرمایەداریی کە تۆوی لەناوچوونی خۆی هەڵگرتووە ، ناتوانێ چارەسەری گیروگرفتی ئلبووریی مرۆڤ بکات. دوای ئەوە لەوەش لاوازترە کە بتوانێت ڕووبەڕوی گیروگرفتی هەژاریی ببێتەوە ، چونکە —سەرمایەداریی لەسەر بنەمای چەوساندنەوەی مرۆڤ بۆ برای مرۆڤی دامەزراوە، ئەوەش خودی ئەوکارەیە کە سۆشیالیستی —وەکو دەڵێن—هەول دەدات بۆ لەناوبردنی —لێرەدا مەبەست لە سۆشیالیستی ئەوەیە کە(فردریك ئینگڵز)ناوی ناوە (سۆشیالیستیی زانستیی)، بۆ جیاکردنەوەی لە بزوتنەوە سۆشیالیستیە پێشووەکان لە ئەوروپا، ئەوانەی کە لە بانگەوازێکی چاکسازیی دەچوون.

(ئینگڵز)رەخنەی لەو بزوتنەوانە دەگرت، گوایا ئەوان تەنها رەخنەیان لە شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداریی و ،رەتکردنەوەی لایەنە خراپەکانی و، تاوانبارکردنی چەوساندنەوەی بۆ چینی کرێکار کردووە ، بەڵام نەیانتوانیووە هۆی ئەو چەوساندنەوەیەو گەوهەرەکەی بزانن،نەیانتوانیووە بزانن (زێدە بایی) کە مارکس دۆزیەوە ، نهێنی ئەو چەوساندنەوەیە .ئینجا (ئینگڵز)کۆتایی قسەکەی بەوە دێنێ‌کە سۆشیالیزم بووە بە زانست، بەهۆی ئەو دوو دۆزینەوە گەورەیەوە کە مارکس دۆزیەوە ، واتە : ( بیرۆکەی شیکردنەوەی ماددی بۆ مێژوو ) لەگەڵ(زێدەبایی)•، ئەوە ئەو نهێنیەیە کە بەرهەمهێنانی سەرمایەداریی

---

• مەبەست لە زێدە بایی ئەوەیە کە سەرمایەدار ناتوانێ‌لە ڕێگای ئەو کەرەسەی بەرهەمهێنانەی کە هەیەتی داهات بەدەست بێنێ ،بەلکو دەبێ بەهۆی کارەوە بێت ،ئینجا لەبەر ئەوەی کار توخمی سەرەکیی کە شمەك بەرهەم دەهێنێ بەهاوکاریی کەرەسەکانی

هەژاردا . ئائەمەشە یەکەم بەربەرەکانی کە رووبکردە ئوممەی ئیسلامیی ، کە قورساییەکی زۆری هەیە لە نێوان ولاّتانی جیهانی سێدا.

بەلاّم روویەکیتری ئەو بەربەرەکانیە ئەوەیە کە پێی دەڵێن:رێگای پەرەپێدانی شۆسیالیستیی ، کە وەکو بەدیلێکی حەتمی بۆ رێبازی سەرمایەداریی خۆرئاوا خۆی خستەروو.

زانستا لە ئەوروپا رویدا، وایاندانا کە لە ئەنجامی سەرکەوتنی زانست بەسەر ئاییندا دەرکەوتووە. هەروەها مارکس بیرۆکەی ماددی مێژوویی ،یان شیکردنەوەی ماددی بۆ مێژووی لە (Holbach Paul(H.O) وەرگرتووە[25] هەتا هەندێئابووریناسان وای بۆدەچن کە مارکس بیرۆکەی (زێدەبایی) لە ریگاردۆ وەرگرتووە و بەکاری هێناوە لە شیکردنەوەکانیدا ،کە لە ئابوریناسی ئەڵمانی Karl Johann Redbertusوەرگرتووە[26].

هەروەها دەبینین ئەو نمونانەی کارڵ مارکس هێناویەتەوە بۆ سەلماندنی بانگەوازەکەی ، دەربارەی حەتمیەتی ناکۆکیی چینایەتی ، لە راستیدا ئاماژەی تەنها بۆ مێژووی رۆمانی کۆن و سەروەریی دەرەبەگایەتی لە ئەوروپای خۆرئاوادا ، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کردووە ..هاوڕێ لەگەڵ دەرکەوتنی بۆرجوازیو چینی کرێکار (برۆلیتاریا) لە سەردەمی شۆڕشی پیشەسازیدا [27]

بۆ کۆتایی هێنان بەم باسە دەڵێین : لە راستیدا سەرمایەداریی و سۆشیالیستی بریتین لە جیهانبینی کۆمەڵگای ئەوروپا ، بۆ ئادەمیزادو چالاکیە ئابووریەکانی ، ئەمە سەرەڕای جیاوازیان لە بارەی خاوەندارێتی کەرەسەکانی بەرهەمهێنان و ، رۆڵی ئالیەتی بازاڕ لە تایبەتکردنی دەرامەتدا.

لەڕاستیدا سۆشیالیزم بانگەوازیکرد بۆ خاوەندارێتی گشتیی‌و ، خاوەندارێتی کۆمەڵایەتی کەرەسە گشتیەکانی بەرهەمهێنان و ، تایبەتکردنی دەرامەتەکان،، لەدووتوێی نەخشەکێشانێکی توندی ناوەندیدا..دوای ئەوەش پەرەپێدان لە کۆمەڵگای سۆسیالیستەکاندا بەگشتیو ،لە شۆرەوی بەتایبەتی،بەسترایەوە بە

---

(25) Isaaiah Berlin Larl Marx ,His Iife and environ
ment ,Oxford University press (H,U.L)third Ed 1963,p.14

(26) ابراهیم دسوقی اباظه ،الاقتصاد الاسلامی ،مقوماته ومنهاجه ،دار الشعب ،قصر العینی ،القاهره ١٩٧٣٣٦

(27) Marx and Englels ,Selected works ,Moscow ,1955 Vol J.pp34-35

لەسەری‌کۆبۆتەو [23]. لای مارکسیەکان ئەوەی لەم قسەیە وەردەگیرێت ئەوەیە، کە پەرەپێدان بۆتە پرۆسەیەك، یاسا ئابووریە زانراوەکان حوکمی لەسەر دەکەن،[24] دەتوانین بەربەرەکانی مارکسیەت بکەین لەو قسەیەیدا کە دەڵێت:ئەوان ئەو یاسایانەیان دۆزیوەتەوە کە حوکمی ئاڵوگۆڕو گەشەکردنی ماددەو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەکات.(المادیە الجدلیە والمادیە التاریخیە) ئەو چارەسەرو بۆچونانەی دەیخەنە بەرچاو بۆ گیروگرفتی ئادەمیزاد لەسەر زەوی ، لە راستیدا ئەوە گوێڕایەڵیە بۆ یاسایەك لە یاساکانی بوونەوەر –لای ئەوان بوونەوەری بێ خوا–(تبارك الله احسن الخالقین)، سەرەڕای ئەوەی سەرمایەداریی چەوسێنەر ڕێباز، عەلمانی ئاراستەیە..بەڵام مۆرکی زانستی بەخۆیەوە نەهێشتووە.

لەگەڵ ئەوەی مارکسایەتی وایدەگەیاند کە دژی ڕێبازی سەرمایەداریی‌و میراتگرییەتی ، لە راستیدا هەردووکیان دوو رووی یەك دراون ، لەرووی ژینگەو ئاراستەی ماددیەوە ، هەروەکو رۆستۆ چیرۆکی گەشەکردنی کۆمەڵگای سەرمایەداریی لە کتێبی ( قۆناغەکانی گەشەکردن) گێڕاوەتەوە ، مارکس چەمکی دیالێکتیکی لە فەلسەفەی هیگڵی (میسالی) •وەرگرتووە و بیرۆکەی بێسەرەتایی ماددەی لە فەلسەفەی بێخوایی (الالحاد) وەرگرتووە،کە باڵی کێشابوو بەسەر زانایانی سەدەی نۆزدەهەمدا، ئەویش لە ئەنجامی ئەو جەنگەی لەنێوان ئایین و

---

بەرهەمهێنان ،کەواتە سەرچاوەی راستەقینەی قازانجی سەرمایەدار بوونی سەرمایەکەی نییە بەڵکو ئەو بەشەیە کە لە نرخی بەرهەمی کارەکوی دەبڕێت(سماعیل صبری عبدالله ،مصدر سابق ص۱۹۱ هامش ۱)

[23] Engles,F.Socialism.scientific andutopian,George Allenand Unwin Ltd ,London.1950,pp.42,43,44.

[24] L,Abalkin ,S,Dzarasov A.Kulikov political economy,progress publishers,Moscow,1983,O.374

•فەیلەسوفی ئیتالی کرۆتشە هەموو ئەوەی کە مارکس کردوویەتی لە جەدەلیەتی هیگڵەوەیە کە ئەو خوایەی هیگڵ ناوی نابوو (ئەقڵ) مارکس ناوەکەی گۆڕی بە (ماددە)،سەیری ئەم کتێبە بکە: Benedetto Croce ,my philosophy George Allen Unwwin Ltd .London ,2nd Impression,1951,p.64

زانستا لە ئەوروپا رویدا، وایاندانا کە لە ئەنجامی سەرکەوتنی زانست بەسەر ئاییندا دەرکەوتووە. هەروەها مارکس بیرۆکەی ماددی مێژوویی ،یان شیکردنەوەی ماددی بۆ مێژووی لە (Holbach Paul(H,O) وەرگرتووە[25] هەتا هەندێئابووریناسان وای بۆدەچن کە مارکس بیرۆکەی (زێدەبایی) لە ریگاردۆ وەرگرتووە و بەکاری هێناوە لە شیکردنەوەکانیدا ،کە لە ئابوریناسی ئەڵمانی Karl Johann Redbertusوەرگرتووە[26].

هەروەها دەبینین ئەو نمونانەی کارڵ مارکس هێناویەتەوە بۆ سەلماندنی بانگەوازەکەی ، دەربارەی حەتمیەتی ناکۆکیی چینایەتی ، لە راستیدا ئاماژەی تەنها بۆ مێژووی رۆمانی کۆن و سەروەریی دەرەبەگایەتی لە ئەوروپای خۆرئاوادا ، لە سەدەکانی ناوەراستدا کردووە ..هاورێ لەگەڵ دەرکەوتنی بۆرجوازیو چینی کرێکار (برۆلیتاریا) لە سەردەمی شۆرشی پیشەسازیدا [27]

بۆ کۆتایی هێنان بەم باسە دەڵێین : لە راستیدا سەرمایەداریی و سۆشیالیستی بریتین لە جیهانبینی کۆمەڵگای ئەوروپا ، بۆ ئادەمیزادو چالاکیە ئابووریەکانی ، ئەمە سەرەرای جیاوازیان لە بارەی خاوەندارێتی کەرەسەکانی بەرهەمهێنان و ، رۆڵی ئالیەتی بازار لە تایبەتکردنی دەرامەتدا.

لەراستیدا سۆشیالیزم بانگەوازیکرد بۆ خاوەندارێتی گشتیو ، خاوەندارێتی کۆمەڵایەتی کەرەسە گشتیەکانی بەرهەمهێنان و ، تایبەتکردنی دەرامەتەکان،، لەدووتوێی نەخشەکێشانێکی توندی ناوەندیدا..دوای ئەوەش پەرەپێدان لە کۆمەڵگای سۆسیالیستەکاندا بەگشتیو ،لە شۆرەوی بەتایبەتی،بەسترایەوە بە

---

[25] Isaaiah Berlin Larl Marx ,His life and environ ment ,Oxford University press (H,U.L)third Ed 1963,p.14

[26] ابراهیم دسوقی اباظه ،الاقتصاد الاسلامی ،مقوماته ومنهاجهه ،دار الشعب ،قصر العینی ،القاهره ١٩٧٢٢٣٦

[27] Marx and Englels ,Selected works ,Moscow ,1955 Vol J.pp34-35

**لەسەریکۆبۆتەو [23]. لای مارکسیەکان ئەوەی لەم قسەیە وەردەگیرێت ئەوەیە، کە پەرەپێدان بۆتە پرۆسەیەك، یاسا ئابووریە زانراوەکان حوکمی لەسەر دەکەن،[24] دەتوانین بەربەرەکانی مارکسیەت بکەین لەو قسەیەیدا کە دەڵێت:ئەوان ئەو یاسایانەیان دۆزیوەتەوە کە حوکمی ئاڵوگۆڕو گەشەکردنی ماددەو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دەکات.(المادیه الجدلیه والمادیه التاریخیه) ئەو چارەسەرو بۆچونانەی دەیخەنە بەرچاو بۆ گیروگرفتی ئادەمیزاد لەسەر زەوی ، لە راستیدا ئەوە گوێڕایەڵیە بۆ یاسایەك لە یاساکانی بوونەوەر -لای ئەوان بوونەوەری بیّ خوا-(تبارك الله احسن الخاقین)، سەرەڕای ئەوەی سەرمایەداریی چەوسێنەر رێباز، عەلمانی ئاراستەیە..بەلاّم مۆرکی زانستی بەخۆیەوە نەهێشتووە.**

**لەگەڵ ئەوەی مارکسایەتی وایدەگەیاند کە دژی رێبازی سەرمایەداریی‌و میراتگرییەتی ، لە راستیدا هەردووکیان دوو رووی یەك دراون ، لەرووی ژینگەو ئاراستەی ماددیەوە ، هەروەکو رۆستۆ چیرۆکی گەشەکردنی کۆمەڵگای سەرمایەداریی لە کتێبی ( قۆناغەکانی گەشەکردن) گێڕاوەتەوە ، مارکس چەمکی دیالێکتیکی لە فەلسەفەی هیگڵی (میسالی) *وەرگرتووە و بیرۆکەی بێسەرەتایی ماددەی لە فەلسەفەی بێخوایی (الالحاد) وەرگرتووە،کە باڵی کێشابوو بەسەر زانایانی سەدەی نۆزدەهەمدا، ئەویش لە ئەنجامی ئەو جەنگەی لەنێوان ئایین و**

---

بەرهەمهێنان ،کەواتە سەرچاوەی راستەقینەی قازانجی سەرمایەدار بوونی سەرمایەکەی نییە بەڵکو ئەو بەشەیە کە لە نرخی بەرهەمی کارەکوی دەبڕێت(سماعیل صبری عبدالله ،مصدر سابق ص١٩١ هامش ١)

(23) Engles,F.Socialism,scientific andutopian,George Allenand Unwin Ltd ,London.1950,pp.42,43,44.

(24) L,Abalkin ,S.Dzarasov A.Kulikov political economy,progress publishers,Moscow,1983,O.374

* فەیلەسوفی ئیتالی کرۆتشە هەموو ئەوەی کە مارکس کردوویەتی لە جەدەلیەتی هیگڵەوەیە کە ئەو خوایەی هیگڵ ناوی نابوو (ئەقل) مارکس ناوەکەی گۆڕی بە (ماددە)،سەیری ئەم کتێبە بکە: Benedetto Croce ,my philosophy George Allen Unwwin Ltd .London ,2nd Impression,1951,p.64

بەدەستی هێنا  لە داهاتی نەتەوەیی و کەرتی پیشەسازیدا ،بەتایبەتی لە بواری پیشەسازیە قورسەکان و پیشەسازیە جەنگیەکاندا، هاوڕێ بوو لەگەڵ دارمانی زۆر گەورەدا لە کەرتی کشتوکاڵیو بەرهەمهێنانی خۆراکدا ، هەروەها هاوڕێ بوو لەگەڵ نەهێشتنی ڕێزو کەرامەتی ئادەمیزادو ، گیان لەدەست دانیان و ، کوت و پێوەندکردنی بیریان. یەکەم کەس ئەو کوێرەوەریانەی ئاشکراکرد ، نیکیتا خرۆشۆف بوو کە لەساڵی ١٩٥٦-بۆ یەکەمجار-بەرامبەر بە گەلی روسیا ئاشکرای کرد، لە کۆنگرەی بیستەمی حزبی کۆمەنستیدا ، کە ستالین پیاکوژ بووە ، کوشتاری بەکۆمەڵی کردووە ، مێژووی شێواندووە[31] یەکێ لە توێژەرە باوەڕپێکراوەکان دەڵێت:نرخی ئەو پەرەپێدانە گەورەیەی کە ستالین بە ئەنجامی گەیاندووە ، زۆر گران بووە، کە بریتی بوو لە لەناوبردنی ملیۆنەها گیانی مرۆڤ، لە پێناوی بنیاتنانی هەزاران ئامێر ، وەکو هەوڵێك بۆ ئامادەکردنی بارودۆخی بژێویەکی باشتر  بۆ ئەوانەی لە ژیاندا ماون[32]  بەلام لەبواری پەرەپێدانی کشتوکاڵدا . ژمارەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن ،کە نەخشەی کشتوکاڵ لە روسیا ، ئامانجی بەهەمهێنانی ١١٩ملیۆن تەن دانەوێڵە بوولە ساڵی ١٩٤٠. بەلام ئەوەی بەرهەم هاتبوو تەنها ٩٥,٦ملیۆن تەن بوو. هەروەها نەخشەی ساڵی ١٩٤٨ وادنرابوو کە ١١٥ ملیۆن تەن بێت ،کەچی تەنها ٦٧,٢ملیۆن تەن بەرهەم هاتووە.

هەروەها نەخشەسازان مژدەیان دەدا کە لە ساڵی ١٩٤٩بڕی ١٢٤ملیۆن تەن بەرهەم دابین دەبێت، بەلام ئەوەی بەهەمیان هێنا تەنها٧٠,٢ملیۆن تەن بوو..بەهەمان شێوە نەخشەی ساڵی ١٩٥١یان زۆر بەگەشبینیەوە دانا بۆ بەرهەمهێنانی ١٣٠ملیۆن تەن . کەچی بەرهەمی راستەقینەیان تەنها٩٢,٢ملیۆن تەن بو[33] ئینجا لەبارەی

---

(31) The Guardian (U.K)Ocotober ,16.1964,p.13

(32) Crankshaw Op.ct pp.10-11

(33) Alec Nvoe ,An economic history of the U.S.S.R. Penguin book ,1969,pp.303.276.225.191

نەخشەی پەرەپێدانی جیاجیا لەڕووی کاتەوە ، لەپێنج سالچەوە بۆ حەوت ساڵ.
یەکەم نەخشەی پێنج ساڵە لە روسیالە یەکی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢٨دەستیپێکرد، یەکلەدوای یەك لەساڵەکانی چلەکان و پەنجاکانداو،دوای ئەویش هەر بەردەوام بوو،ئەوەش بوو بەهۆی دەرچوونی روسیا لە کۆمەڵگایەکی کشتوکاڵیی سەرەتاییەوە ، بۆ ئاستی دەوڵەتە پیشەسازیە سەرمایەداریە گەورەکان [28] بوو بە دووەم دەوڵەت لەناویاندا،سەرجەمی بەرهەمی پیشەسازیی سەرمایەداریی بەتێکڕای ١٣٪گەشەی کرد لەساڵەکانی (١٩٥١-١٩٥٦)،هەوڵی دەدا بۆ زیاتر کردنی داهاتی تاکەکەس بەتێکڕایەك کەپێش دەوڵتە سەرمایەدارەکان بکەوێت [29] سەرچاوەکانی شۆرەوی ئاماژە بەوە دەکەن کە کۆمەڵەی دەوڵەتە سۆشیالیزمەکان ، لەناویاندا روسیا گەشەیەکی ساڵانەیان کردووە ،لە داهاتی نەتەوەییدا لەساڵەکانی ( ١٩٥١-١٩٨٠)بە تێکڕای ٧,٣٪بەرامبەر ٤٪ کۆمەڵی دەوڵەتە سەرمایەدارەکان ، لە ناویاندا ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا[30]
ئینجا بانگخوازانی سۆشیالیزمی زانستیی ، ئەزموونەکەی شۆرەوییان کرد بە بەڵگەی راستیی بیردۆزەی مارکسایەتیو ،سەرکەوتنی بەرنامەی سۆسیالیستی لە پەرەپێداندا . بەلاَم ئەوان بێئاگابوون لە زۆر راستیی گرنگ لە هەڵسەنگاندنی ئەزموونی شۆرەویدا، کە بەروونی دەرنەکەوتبوون.،هەتا دوای لەناوچوونی ستالین ( ٦ئازاری ١٩٥٣( و دەرکەوتنی خرۆشۆف،ئەوکاتە بەئاشکرا دوای ئەوەی گۆرباتشۆف بوو بە ئەمینداری کۆمیتەی ناوەندیی حزبی کۆمەنستی شۆرەوی ، لە ئازاری ١٩٨٥ئەو هەلاَنە دەرکەوتن ، ئەوانەی بە ئەزموونی شۆرەوی دڵخۆشبوون ، باسی ئەوەیان نەکردبوو کە شانبەشانی ئەو پێشکەوتنە گەورەیەی کە روسیا

---

[28] Edward Crankshaw, Khrushochev s Russia,Penguin,1959,p,21
[29] John Long ,Modern Russia Gerald Duch worth and Co,Ltd .London .1957 ,pp.106
[30] L.Abalkin and others , Ploitical economiy ,op.cit ,p.,306

بەدەستی هێنا  لە داهاتی نەتەوەیی و کەرتی پیشەسازیدا ،بەتایبەتی لە بواری پیشەسازیە قورسەکان و پیشەسازیە جەنگیەکاندا، هاوڕێ بوو لەگەڵ دارمانی زۆر گەورەدا لە کەرتی کشتوکاڵیو بەرهەمهێنانی خۆراکدا ، هەروەها هاوڕێ بوو لەگەڵ نەهێشتنی ڕێزو کەرامەتی ئادەمیزادو ، گیان لەدەست دانیان و ، کۆت و پێوەندکردنی بیریان. یەکەم کەس ئەو کوێرەوەریانەی ئاشکراکرد ، نیکیتا خرۆشۆف بوو کە لەساڵی ١٩٥٦-بۆ یەکەمجار-بەرامبەر بە گەلی روسیا ئاشکرای کرد، لە کۆنگرەی بیستەمی حزبی کۆمەنستیدا ، کە ستالین پیاکوژ بووە ، کوشتاری بەکۆمەڵی کردووە ، مێژووی شێواندووە[31] یەکێ لە توێژەرە باوەڕپێکراوەکان دەڵێت:نرخی ئەو پەرەپێدانە گەورەیەی کە ستالین بە ئەنجامی گەیاندووە ، زۆر گران بووە، کە بریتی بوو لە لەناوبردنی ملیۆنەها گیانی مرۆڤ، لە پێناوی بنیاتنانی هەزاران ئامێر ، وەکو هەوڵێك بۆ ئامادەکردنی بارودۆخی بژێویەکی باشتر  بۆ ئەوانەی لە ژیاندا ماون[32]  بەڵام لەبواری پەرەپێدانی کشتوکاڵدا . ژمارەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن ،کە نەخشەی کشتوکاڵ لە روسیا ، ئامانجی بەهەمهێنانی ١١٩ملیۆن تەن دانەوێڵە بوولە ساڵی ١٩٤٠. بەڵام ئەوەی بەرهەم هاتبوو تەنها ٩٥,٦ملیۆن تەن بوو. هەروەها نەخشەی ساڵی ١٩٤٨ وادنرابوو کە ١١٥ ملیۆن تەن بێت ،کەچی تەنها ٦٧,٢ملیۆن تەن بەرهەم هاتووە.

هەروەها نەخشەسازان مژدەیان دەدا کە لە ساڵی ١٩٤٩بڕی ١٢٤ملیۆن تەن بەرهەم دابین دەبێت، بەڵام ئەوەی بەهەمیان هێنا تەنها٧٠,٢ملیۆن تەن بوو..بەهەمان شێوە نەخشەی ساڵی ١٩٥١یان زۆر بەگەشبینیەوە دانا بۆ بەرهەمهێنانی ١٣٠ملیۆن تەن . کەچی بەرهەمی راستەقینەیان تەنها٩٢,٢ملیۆن تەن بو[33] ئینجا لەبارەی

---

[31] The Guardian (U.K)Ocotober ,16.1964,p.13
[32] Crankshaw Op.ct pp.10-11
[33] Alec Nvoe ,An economic history of the U.S.S.R. Penguin book ,1969,pp.303.276.225.191

نەخشەی پەرەپێدانی جیاجیا لەڕووی کاتەوە ، لەپێنج سالچەوە بۆ حەوت سالْ.
یەکەم نەخشەی پێنج ساڵە لە روسیالە یەکی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٢٨دەستیپێکرد، یەکلەدوای یەك لەساڵەکانی چلەکان و پەنجاکانداو،دوای ئەویش هەر بەردەوام بوو،ئەوەش بوو بەهۆی دەرچوونی روسیا لە کۆمەڵگایەکی کشتوکاڵیی سەرەتاییەوە ، بۆ ئاستی دەوڵەتە پیشەسازیە سەرمایەداریە گەورەکان [28]
بوو بە دووەم دەوڵەت لەناویاندا،سەرجەمی بەرهەمی پیشەسازیی سەرمایەداریی بەتێکڕای ١٣٪گەشەی کرد لەساڵەکانی (١٩٥١-١٩٥٦)،هەوڵی دەدا بۆ زیاتر کردنی داهاتی تاکەکەس بەتێکڕایەك کەپێش دەوڵتە سەرمایەدارەکان بکەوێت [29]
سەرچاوەکانی شۆرەوی ئاماژە بەوە دەکەن کە کۆمەڵەی دەوڵەتە سۆشیالیزمەکان ، لەناویاندا روسیا گەشەیەکی ساڵانەیان کردووە ،لە داهاتی نەتەوەییدا لەساڵەکانی ( ١٩٥١-١٩٨٠)بە تێکڕای ٧,٣٪بەرامبەر ٤٪ کۆمەڵی دەوڵەتە سەرمایەدارەکان ، لە ناویاندا ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا[30]
ئینجا بانگخوازانی سۆشیالیزمی زانستیی ، ئەزموونەکەی شۆرەوییان کرد بە بەڵگەی راستیی بیردۆزەی مارکسایەتیو ،سەرکەوتنی بەرنامەی سۆسیالیستی لە پەرەپێداندا . بەلأم ئەوان بێئاگابوون لە زۆر راستیی گرنگ لە هەڵسەنگاندنی ئەزموونی شۆرەویدا، کە بەروونی دەرنەکەوتبوون.،هەتا دوای لەناوچوونی ستالین ( ٦ئازاری ١٩٥٣)( و دەرکەوتنی خرۆشۆف،ئەوکاتە بەئاشکرا دوای ئەوەی گۆرباتشۆف بوو بە ئەمینداری کۆمیتەی ناوەندیی حزبی کۆمەنستی شۆرەوی ، لە ئازاری ١٩٨٥ئەو هەلأنە دەرکەوتن ، ئەوانەی بە ئەزموونی شۆرەوی دڵخۆشبوون ، باسی ئەوەیان نەکردبوو کە شانبەشانی ئەو پێشکەوتنە گەورەیەی کە روسیا

---

Edward Crankshaw, Khrushochev s Russia,Penguin,1959,p,21[28]
[29] John Long ,Modern Russia Gerald Duch worth and Co,Ltd .London .1957 ,pp.106
[30] L.Abalkin and others , Ploitical economiy ,op.cit ,p.,306

گەورەترین بەرهەمهێنی رەقەمەنی (الصلب)و کەرەسەی کاڵ و سووتەمەنیو وزەی جیهانی بوو، رووبەڕووی کەموکوڕی بوویەوە لەو بەرهەمانەدا بەهۆی بەگەڕخستنی بەفیڕۆنەدان یا نەشارەزایانەوە.[38]

هەروەها لە رەخنەگرتن لە دەرهاویشتە کۆمەڵایەتیەکانی ئەزموونی سۆشیالیستی ، گۆرباتشۆف دەڵێت:( هەمیشە پیاهەڵدان و ملکەچیو پشتگوێخستنی بۆچوونەکان و ،پێداویستیەکانی خەڵکە گشتیەکەو،رای گشتی هاندەدرا.هەڵسەنگاندنی گۆترەکاریو ساکار دەکراو ، بەڕاستیەکی قسەهەڵنەگریش دادەنران، قسەو کردار لەیەکتر جیابوونەوە ، تاوایلێهات هەرچی لە بڵندگۆکانی راگەیاندن و، رۆژنامەکان و ، کتێبەکانی خوێندنەوە رادەگەیەنرا،بووبوو بە جێگای گومان و پرسیار، بەدڕەفتاریی لە رەوشتە گشتیەکاندا بلاوبوویەوە ، خوگرتن بە خواردنەوەی سەرخۆشکەرو ماددە سڕکەرەکان و تاوانکاریەوە زۆرتر بووبوو[39]

زەقترین شت کە پێرسترۆیکا جەختی لەسەر کردەوە ، ئەوەبوو کە ، ئەو شێوازی گەشەکردنەی ، کە لەبنەماکانی مارکسیی لینینیی هەڵقولابوو ، گەیشت بە رێگایەکی تەواو داخراو، هەروەکو سەرمایەداریی بەسەریهات کە بنەماکانی دادگەریی کۆمەڵایەتی بەتاڵکردەوەو ، چینی رۆشنبیری ولاتە هەژارەکانی ، لە بنکە رەسەنەکەی خۆی دابڕیو، بەستیەوە بە بەرنامەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداریو بەهاکانیو شێوازی رەفتارو رەوشتیەوە.

هەموو ئەوەی لە شۆسیالیستی زانستیی پەیدابووە ، ئەوەیە کە ستەمی سەرمایەداریی گۆڕیووە بە جۆرێکیتر لە ستەم، کە لەسەر جیاوازیی چینایەتی راوەستاوە، لە دابەشکردنی دەسەلات، لە نێوان ئەوانەی هەموو دەسەلاتیان

---

[38] هەمان سەرچاوە

[39] هەمان سەرچاوە ل/١٩

پەرەپێدانی سامانی ئاژەڵدارییەوە، ژمارەکانی ساڵی ١٩٥٠ بەگشتی ، زۆر کەمتربوون لە ژمارەکانی ساڵی ١٠٢٨، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ دژایەتی جوتیاران ، بۆ نەزمی کێڵگەی کشتوکاڵی بەکۆمەڵCollectivization،تا رادەیەکیش بارودۆخی جەنگی دووەمی جیهانیی[34] بەڵام گەورەترین رەخنە کە رووبەڕووی ئەزموونی سۆشیالیستی روسیا بوویەوە،ئەوەبوولەسەر زمانی سەرۆکی شۆرەوی گۆرباتشۆف لە کتێبەکەیدا بنیاتنانەوە(پێرسترۆیکا) کە دەڵێ ( لە نیوەی دووەمی حەفتاکاندا شتێك روویدا ،لەسەرەتادا تەفسیری نەبوو،وڵات-روسیا-دەستیکرد بە ونکردنی هێزی هاندان و دووپاتبوونەوەی دارمانی پابووری بەپلەیەکی گەورەتر کاتی شیتەڵ کردنی بارودۆخەکە هەرلەسەرەتاوە بۆماندەرکەوت ، کە گەشەی ئابووری لە پانزە ساڵی دواییدا زۆر شێنەیی بوو، تێکڕای گەشە داهاتی نەتەوە دارمانی دەستپێکرد بۆ زیاتر لە نیوە،بەهاتنی هەشتاکان دابەزی بۆ ئاستی نزیك لە وەستانی ئابووری(رکود).[35] لەگەڵ ئەوەی -شۆرەوی-لە گەورەترین بەرهەمهێنەکانی دانەوێڵە بوو، کەچی ناچاربوو ملیۆنەها تەن دانەوێڵە بکڕێت بۆ ئاڵف..تێکڕاکانی گەشەکردن بەخێرایی نزم دەبوویەوە، هەرچی چاودێری لەسەر چاکجۆریی هەبوو بەباشی کاری نەدەکرد، کۆسپی زۆر هەبوو لەبەردەم.ئامادەکردنی خۆراك و نیشتەجێکردن و شمەکی بەکاربردن و کارگوزارییەکاندا [36] بزاوتی هاندەری کۆی بەرهەم بەتایبەتی لە پیشەسازیە قورسەکاندا،لە ریزی پێشەوە دانرابوون و بووبوون بە تاقە مەبەست[37]. هەروەها بارودۆخێکی خراپ گەشەی دەکرد،شۆرەوی کە

---

[34] Crankshaw , Op.cit.p.138

[35] میخائیل غورباتشوف ،البیرسترویکا ترجمة حمدي عبدالجواد ،دار الشروق ،القاهرة ط١ ١٩٨٨ص١٥

[36] سەرچاوەی پێشو ل ١٦، -١٨

[37] هەمان سەرچاوە ل:١٨

گەورەترین بەرهەمهێنی رەقەمەنی (الصلب)و کەرەسەی کاڵ و سووتەمەنیو وزەی جیهانی بوو، رووبەڕووی کەموکوڕی بوویەوە لەو بەرهەمانەدا بەهۆی بەگەڕخستنی بەفیڕۆنەدان یا نەشارەزایانەوە.[38]

هەروەها لە رەخنەگرتن لە دەرهاویشتە کۆمەڵایەتیەکانی ئەزموونی سۆشیالیستی ، گۆرباتشۆف دەڵێت:( هەمیشە پیاهەڵدان و ملکەچیو پشتگوێخستنی بۆچوونەکان و ،پێداویستیەکانی خەڵکە گشتیەکەو،رای گشتی هاندەدرا.هەڵسەنگاندنی گۆترەکارییو ساکار دەکراو ، بەڕاستیەکی قسەهەڵنەگریش دادەنران، قسەو کردار لەیەکتر جیابوونەوە ، تاوایلێهات هەرچی لە بڵندگۆکانی راگەیاندن و، رۆژنامەکان و ، کتێبەکانی خوێندنەوە رادەگەیەنرا،بووبوو بە جێگای گومان و پرسیار، بەدڕەفتاریی لە رەوشتە گشتیەکاندا بڵاوبوویەوە ، خوگرتن بە خواردنەوەی سەرخۆشکەرو ماددە سڕکەرەکان و تاوانکاریەوە زۆرتر بووبوو[39]

زەقترین شت کە پێرسترۆیکا جەختی لەسەر کردەوە ، ئەوەبوو کە ، ئەو شێوازی گەشەکردنەی ، کە لەبنەماکانی مارکسیی لینینیی هەڵقوڵابوو ، گەیشت بە رێگایەکی تەواو داخراو، هەروەکو سەرمایەداریی بەسەریهات کە بنەماکانی دادگەریی کۆمەڵایەتی بەتاڵکردەوەو ، چینی رۆشنبیری وڵاتە هەژارەکانی ، لە بنکە رەسەنەکەی خۆی دابڕیو، بەستیەوە بە بەرنامەکانی کۆمەڵگای سەرمایەدارییو بەهاکانیو شێوازی رەفتارو رەوشتیەوە.

هەموو ئەوەی لە شۆسیالیستی زانستیی پەیدابووە ، ئەوەیە کە ستەمی سەرمایەداریی گۆڕیووە بە جۆرێکیتر لە ستەم، کە لەسەر جیاوازیی چینایەتی راوەستاوە، لە دابەشکردنی دەسەڵات، لە نێوان ئەوانەی هەموو دەسەڵاتیان

---

[38] هەمان سەرچاوە

[39] هەمان سەرچاوە ل/١٩

پەرەپێدانی سامانی ئاژەڵدارییەوە، ژمارەکانی ساڵی ١٩٥٠ بەگشتی ، زۆر کەمتربوون لە ژمارەکانی ساڵی ١٠٢٨، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ دژایەتی جوتیاران ، بۆ نەزمی کێڵگەی کشتوکاڵی بەکۆمەڵCollectivization،تا رادەیەکیش بارودۆخی جەنگی دووەمی جیهانیی[34] بەڵام گەورەترین رەخنە کە رووبەڕووی ئەزموونی سۆشیالیستی روسیا بوویەوە،ئەوەبوولەسەر زمانی سەرۆکی شۆرەوی گۆرباتشۆف لە کتێبەکەیدا بنیاتنانەوە(پێرسترۆیکا) کە دەڵێ ( لە نیوەی دووەمی حەفتاکاندا شتێك روویدا ،لەسەرەتادا تەفسیری نەبوو،وڵات–روسیا–دەستیکرد بە ونکردنی هێزی هاندان و دوویاتبوونەوەی دارمانی پابووری بەپلەیەکی گەورەتر کاتی شیتەڵ

کردنی بارودۆخەکە هەرلەسەرەتاوە بۆماندەرکەوت ، کە گەشەی ئابووری لە پانزە ساڵی دواییدا زۆر شێنەیی بوو، تێکڕای گەشە داهاتی نەتەوە دارمانی دەستپێکرد بۆ زیاتر لە نیوە،بەهاتنی هەشتاکان دابەزی بۆ ئاستی نزیك لە وەستانی ئابووری(رکود).[35] لەگەڵ ئەوەی –شۆرەوی–لە گەورەترین بەرهەمهێنەکانی دانەوێڵە بوو، کەچی ناچاربوو ملیۆنەها تەن دانەوێڵە بکرێت بۆ ئاڵف..تێکڕاکانی گەشەکردن بەخێرایی نزم دەبوویەوە، هەرچی چاودێری لەسەر چاکجۆریی هەبوو بەباشی کاری نەدەکرد، کۆسپی زۆر هەبوو لەبەردەم.ئامادەکردنی خۆراك و نیشتەجێکردن و شمەکی بەکاربردن و کارگوزارییەکاندا [36] بزاوتی هاندەری کۆی بەرهەم بەتایبەتی لە پیشەسازیە قورسەکاندا،لە ریزی پێشەوە دانرابوون و بووبوون بە تاقە مەبەست[37]. هەروەها بارودۆخێکی خراپ گەشەی دەکرد،شۆرەوی کە

---

[34] Crankshaw , Op.cit.p.138

[35] میخائیل غورباتشوف ،البیرسترویکا ترجمة حمدی عبدالجواد ،دار الشروق ،القاهرة ط١ ١٩٨٨ص١٥

[36] سەرچاوەی پێشو ل ،١٦–١٨

[37] هەمان سەرچاوە ل:١٨

# پەرەپێدان لە دیدی ئیسلامەوە

## پەرەپێدان یان ئاوەدانکردنەوە:

ئەگەرچی زانایانی هاوچەرخی ئیسلام،لە قۆناغی وەڵامدانەوەی پرسیارە سادەو ساکارەکان تێپەڕیون، ئەو پرسیارانەی کە لە سەرەتای دەیەی شەشەمی ئەم سەدەیەوە(سەدەی بیست) دەوروژێنرا:ئایا ئیسلام ئایین و دەوڵەتە ؟ بیروباوەڕە یان ئابووری؟ شەریعەت و یاسایە یان بەهای رەوشتیی؟ لەگەڵ ئەوە هەموویدا، دەنگێک بڵند دەبێتەوە و ، داوای راستیی دەکات و ، دەپرسێت: باشە، بۆمان سەلمێنرا کە ئیسلام ئایین و دەوڵەتە ، بیروباوەڕو شەریعەتە ، زامنداریی یەکتریو بەزەییە، ئەی ئایا پەیوەندی چیە بە پەرەپێدانی ئابووریەوە؟ کە زانستێکی نوێیەو بنیاتنراوە لەسەر سەرژمێریەکانی داهاتی نەتەوەو ، دیاریکردنی تێکڕای گەشەکردن لە روانگەی پێدراوەکانەوە،کە بە ژمارەو هاوکێشەی بیرکارییو،وێنە روونکەرەکان دەردەبڕێت دامەزراوە؟

ئایا پەیوەندی ئیسلام بەمانە هەموویانەوە چیە، خۆ ئەوانە ناچنە بەشی زەکات و خێرو چاکەکردن..ئایا کۆڵێک نادەن بە کۆڵی ئیسلامدا کە نەتوانێ هەڵی بگرێت؟؟

لێرەدا زانایانی هاوچەرخ ، کە درێغیان نەکردووە لە هیچ هەوڵێک بۆ روونکردنەوەی دیدی ئیسلام، بۆ پەرەپێدان و ئەو نیشانانەی پێی جیادەبێتەوە ،بە پشتبەستن بە دەقەکانی قورئان و سوننەتەوەو، ئەو ئاماژە ئابووریانەی ، لە کتێبی هەندێ لە زانا موسڵمانەکانەوە هاتووە ،وەکو ئیبن خەلدون لە کتێبی (المقدمە )داو، ئەحمەد بن عەلی ئەلدەلجی لە کتێبی (فی الفلاکە و المفلکون) دا، هەروەها پێشەوا ئەبو یوسف لە کتێبی (الخراج)دا"[42]. بەڵام ئەوان-وەکو دەردەکەوێت-زۆر

---

[42] فؤاد شندي ،التنمية الاقتصادية في الاندلس ،الاندلس للاعلام ،القاهرة ١٩٨٧ص٤٧

بەدەستە-کە کەمایەتیەکی کاربەدەستن و ، ئەوانەی هیچیان بدەست نییە ، کە زۆربەی هەرەزۆرن [40]. ئەو رووداوانەی لە ئەوروپای خۆرئاوا روودەدەن ، بەڵگەیە لەسەر سروشتی ئەو زۆرانبازیە بێوێنەیە. حیزبە سۆشیالیستە کاربەدەستەکانی ئەوروپای خۆرهەلأت، دەڵێن:ئەوان پێشرەوی چینی کرێکارن و، بەزمانی ئەوانەوە قسەدەکەن، کەچی بزووتنەوەی هاوکاریی پۆڵەنداو ، تەقینەوەی بارودۆخی مەجەرو ، ئەڵمانیای خۆرهەلأت و چیکۆسلۆفاکیا، ئاماژە بۆ دیاردەیەکی نویٚ دەکەن، کە هەموو ئەو بناغانەی تێکوپێکدا، کە مارکس بیردۆزەی ناکۆکی چینایەتی لەسەر دامەزراندبوو، ئەوەش خاڵیبوونەوەی تەفسیری ماددی مێژوو دەگەیەنن،لە ناوەرۆکە بنچینەییەکەیدا(ناکۆکیی چینایەتیی)و ، دارِنینی بیرۆکەی مارکسایەتی لە بەرگی زانست، کە بانگەوازی بۆ دەکرد.

ئەگەر بەرهەمی پەرەپێدانی سۆشیالیستی ، لەماوەی پانجا ساڵدا یا زیاتریش، لە گەورەترین دەوڵەتی سۆشیالیزمدا ، بریتی بێت لە داگیرکردنی ئاسمان و ، کەمیی خۆراك و ،سرِینەوەی کەسێتی ئادەمیزادو، بەتاڵکردنەوەی ئەقڵیو ، خراپاندنی رەوشتەکانیو ، شێواندنی مێژووەکەی*. ئەگەر سەرمایەدارییی ، خۆشیی ژیان و، فرەیی شمەکی بەکاربردنی کرِیبێت بە هەڵوەشاندنەوەی خێزان و، رزگاربوون لە دایك و باوك و پیرەکان ، بەناردنیان بۆ پەناگای پەککەوتەکان؟ هەروەها زیاتربوونی تاوانکارییو ، توندوتیژی بەکارهێنان و، خووگرتن و ئالوودەبوون بە ماددە سرِکەرەکانەوەو، بەدرِەفتارییو ، بەرزبوونەوەی ئاستی خۆکوشتن [41]

ئەی ئایا چ جوانیەك بۆ ژیان ماوەتەوە ؛ بۆ ئەو گەلەی کە پشتی کردۆتە پاداشت و سزای رۆژی قیامەت؟؟

---

[40] ابراهیم دسەقی اباڤە .مصدر

[41] سماعیل صبری عبدالله (بتصرف)نحو نظام اقتصادی عالمی جدید ،مصدر سابقص١٥٥

# پەرەپێدان لە دیدی ئیسلامەوە

## پەرەپێدان یان ئاوەدانکردنەوە:

ئەگەرچی زانایانی هاوچەرخی ئیسلام،لە قۆناغی وەڵامدانەوەی پرسیارە سادەو ساکارەکان تێپەڕیون، ئەو پرسیارانەی کە لە سەرەتای دەیەی شەشەمی ئەم سەدەیەوە(سەدەی بیست) دەوروژێنرا:ئایا ئیسلام ئایین و دەوڵەتە ؟ بیروباوەڕە یان ئابووری؟ شەریعەت و یاسایە یان بەهای رەوشتیی؟ لەگەڵ ئەوە هەموویدا، دەنگێك بڵند دەبێتەوە و ، داوای راستیی دەكات و ، دەپرسێت: باشە، بۆمان سەلمێنرا کە ئیسلام ئایین و دەوڵەتە ، بیروباوەڕو شەریعەتە ، زامندارییی یەکتریو بەزەییە، ئەی ئایا پەیوەندی چیە بە پەرەپێدانی ئابوورییەوە؟ کە زانستێکی نوێیەو بنیاتنراوە لەسەر سەرژمێریەکانی داهاتی نەتەوەو ، دیاریکردنی تێکڕای گەشەکردن لە روانگەی پێدراوەکانەوە،کە بە ژمارەو هاوکێشەی بیرکارییو،وێنە روونکەرەکان دەردەبڕێت دامەزراوە؟

ئایا پەیوەندی ئیسلام بەمانە هەموویانەوە چیە، خۆ ئەوانە ناچنە بەشی زەکات و خێرو چاکەکردن..ئایا کۆڵێك نادەن بە کۆڵی ئیسلامدا کە نەتوانێ هەڵی بگرێت؟؟

لێرەدا زانایانی هاوچەرخ ، کە درێغیان نەکردووە لە هیچ هەوڵێك بۆ روونکردنەوەی دیدی ئیسلام، بۆ پەرەپێدان و ئەو نیشانانەی پێی جیادەبێتەوە ،بە پشتبەستن بە دەقەکانی قورئان و سوننەتەوەو، ئەو ئاماژە ئابوورییانەی ، لە کتێبی هەندێ لە زانا موسڵمانەکانەوە هاتووە ،وەکو ئیبن خەلدون لە کتێبی (المقدمە )داو، ئەحمەد بن عەلی ئەلدەلجی لە کتێبی (فی الفلاکە و المفلکون) دا، هەروەها پێشەوا ئەبو یوسف لە کتێبی (الخراج)دا[42]. بەڵام ئەوان-وەکو دەردەکەوێت-زۆر

[42] فؤاد شندی ،التنمیة الاقتصادیة فی الاندلس ،الاندلس للاعلام ،القاهرة ١٩٨٧ص٤٧

بەدەستە–کە کەمایەتیەکی کاربەدەستن و ، ئەوانەی هیچیان بدەست نییە ، کە زۆربەی هەرەزۆرن [40]. ئەو رووداوانەی لە ئەوروپای خۆرئاوا روودەدەن ، بەڵگەیە لەسەر سروشتی ئەو زۆرانبازیە بێوێنەیە. حیزبە سۆشیالیستە کاربەدەستەکانی ئەوروپای خۆرهەلآت، دەڵێن:ئەوان پێشرەوی چینی کرێکارن و، بەزمانی ئەوانەوە قسەدەکەن، کەچی بزووتنەوەی هاوکاریی پۆڵەنداو ، تەقینەوەی بارودۆخی مەجەرو ، ئەڵمانیای خۆرهەلآت و چیکۆسلۆفاکیا، ئاماژە بۆ دیاردەیەکی نویٚ دەکەن، کە هەموو ئەو بناغانەی تێکوپێکدا، کە مارکس بیردۆزەی ناکۆکی چینایەتی لەسەر دامەزراندبوو، ئەوەش خاڵیبوونەوەی تەفسیری ماددی مێژوو دەگەیەنن،لە ناوەرۆکە بنچینەییەکەیدا(ناکۆکیی چینایەتیی)و ، دارنینی بیرۆکەی مارکسایەتی لە بەرگی زانست، کە بانگەوازی بۆ دەکرد.

ئەگەر بەرهەمی پەرەپێدانی سۆشیالیستی ، لەماوەی پانجا ساڵدا یا زیاتریش، لە گەورەترین دەوڵەتی سۆشیالیزمدا ، بریتی بێت لە داگیرکردنی ئاسمان و ، کەمیی خۆراك و ،سڕینەوەی کەسێتی ئادەمیزادو، بەتاڵکردنەوەی ئەقڵیو ، خراپاندنی رەوشتەکانیو ، شێواندنی مێژووەکەی*. ئەگەر سەرمایەداریی ، خۆشیی ژیان و، فرەیی شمەکی بەکاربردنی کڕیبێت بە هەڵوەشاندنەوەی خێزان و، رزگاربوون لە دایك و باوك و پیرەکان ، بەناردنیان بۆ پەناگای پەککەوتەکان؟ هەروەها زیاتربوونی تاوانکارییو ، توندوتیژی بەکارهێنان و، خووگرتن و ئالوودەبوون بە ماددە سڕکەرەکانەوەو، بەدڕەفتارییو ، بەرزبوونەوەی ئاستی خۆکوشتن [41]

ئەی ئایا چ جوانیەك بۆ ژیان ماوەتەوە ، بۆ ئەو گەلەی کە پشتی کردۆتە پاداشت و سزای رۆژی قیامەت؟؟

---

(40)لبراهیم دسەقی اباڤە ،مصدر

(41)سماعیل صبری عبدالله (بتصرف)نحو نظام اقتصادی عالمی جدید ،مصدر سابقص١٥٥

**پەیوەندی پێوەی هەیە لە چاودێریی کۆمەڵایەتیو فێرکاریی‌و خۆشگوزەرانی ، کە ملیشدەنێت بۆ جوانکاریەکان و ، ئاداب و هونەریش، ئەمانە هەمووی دەگرێتەوە.**

**ئینجا دوای ئەوە وا دەردەکەوێت کە زاراوەی گەشە، زۆر قۆناغی پینەکردنی بڕیووە بۆ ئەوەی ئامانجە نوێکان بگرێتەوە ،لەگەڵ ئەوەشدا زاراوەکە بەندە بە مەبەستە ماددیە سنووردارو دنیاییەکانەوە ، نەگەیشتۆتە ئاستی چەمکی ئیسلامیی‌و قوڵیەکەی‌و گشتگیریەکەی.**

# ڕێبازی ئیسلام

**بەلاّم ئاوەدانکردنەوە (العمران)• لە چوارچێوەی بیری ئیسلامیدا ،پەلدەهاوێژێت بۆ ئاسۆیەکی فراوانتر، نەك تەنها زیادبوونی بەرهەم و داهاتی نەتەوە ، یا راستکردنەوەی پەیکەریی(هیکلی) لە بونیادی ئابووریداو، خۆی دەگەیێنێتە دیاریکردنی ئامانجەکانی ژیان و پەیامی ئادەمیزاد لە ئاوەدانکردنەوەی زەویدا، لە روانگەی ئەو مەبەستەی ئادەمیزادی لە پێناودا دروستکراوە،ئەویش بەندایەتیە بۆ خوای تاك و تەنها، چونکە لە روانگەی موسڵمانەوە ، بەبێ یەکتاپەرستی ، ناتوانین وێنای ئاوەدانکردنەوەی زەوی بکەین. ئینجا بەپێی ئەو دیدە ئیسلامیە ، یا ئەو رێبازە ئیسلامیە ، تەنها ئابووری‌و خۆشگوزەرانی ئابووری ، تەوەرو خولگەی ژیانی مرۆڤایەتی ئامانجی بەرزی مرۆڤ نین، کە پێداویستەکانی تاکەکان و کۆمەڵگاش لەوێدا دەوەستێ، بەلاّم ئابووری‌و پەرەپێدان دەبن بەو بەشەی کە مامەڵەو پەیوەندییە مادیەکانی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگا رێکدەخەن، کە**

---

• ئەم بەراوردە مەبەستی ورووژاندنی جەنگی زاراوەکان نیە ،ئەوەندەی مەبەستی روونکردنەوەی پرۆگرامی ئیسلامە لە چارەسەری کێشە ئابووریەکاندا

رانەوەستاون لە سەر هەندێ لە لایەنە پیادەکراوەکانی پەرەپێدان لە مێژووی ئیسلامداو،کاریگەریی لەسەر بنیاتنانی نمونەی پەرەپێدانی ئیسلامیی، چونکە ئەوان-بەخێرایی-چەمکی ئاوەدانکاریان(العمران) تێپەڕاند، بۆ وتووێژ لەسەر پەرەپێدان لە چوارچێوەیەکدا، نزیك بێت لەچەمکی خۆرئاوایی هاوچەرخ...

فەرمانی سێیەم، ئەوان بە روونی پەیوەندی نێوان چەمکی ئیسلامیی پەرەپێدان و،ئەو شێوازە هونەریەی(چەمکەکە)دادەبەزێنێتە سەر واقیعی کۆمەڵگای هاوچەرخ، دیاریی نەکردووە، لەبەر ئەوە زاراوەی (ئاوەدانکردنەوەی مرۆیی )کە ئیبن خەلدون بەکاریهێناوە ، هەڵوێستەیەکی پێکردم ، ئەو زاراوەیە کە خەریکە دەبێتە هاوتا بۆ دەستەواژەی (ژیاری مرۆڤایەتی) یان (ژیارەکان). بەلاّم ئیبن خەلدون ئەو دەستەواژەیەی لە جێگای تریشدا بەکارهێناوە بە واتای گەشەو پەرەپێدان و فرەییو، چاکیی خەڵکی بە نەشونمای سامان و پاکبوونەوەی ...بە دانانی بە لایەنێك لە لایەنەکانی ژیار یا کۆبوونەوەی مرۆیی.[43]

لە سەرەتای ئەم باسەدا دیمان چۆن زاراوەی ((گەشە)) گۆڕا بۆ ((پەرەپێدان))، بۆ ئەوەی دەربڕی ناوەرۆکێکی فراوانتر بێت لە گەشە، ئینجا وشەی ((پەرەپێدان))، خۆیشی ملکەچکرا بۆ گۆڕانکاریی زیاتر، بۆ زیادکردنی ڕەهەندی نوێی بۆ بیرۆکەکە هەتا بوو بە ((پەرەپێدانی ئابووری))، ئینجا بوو بە ((پەرەپێدانی ئابووری کۆمەلاّیەتی))Cocio Economic Development، دوای ئەوەی وشەی ((گەشە))تەنها مانای زیادبوونی داهاتی نەتەوەی دەدا بەدەستەوە ،بەهۆی ئەو گۆڕانکاریانەوە ، لەو چەمکە پەڕیەوە بۆ ئەوەی مانای گەشەی گەورەو ، دادگەریی کۆمەلاٌیەتی و پێشخستنی ژیانی ماددی ئادەمیزاد بگرێتەوە ، لەگەڵ ئەوەی

---

[43] ئیبن خەلدون لە ساڵی ١٣٣٢زایینی لە تونس لەدایك بووە ، لەساڵی ١٤٠٦ لە قاهرە کۆچی دوایی کردووە(المقدمة ،تحقیق علی عبدالواحد وافی لجنة البیان العربی ط١ ١٩٥٧ج٢ص٧١٧

پەیوەندی پێوەی هەیە لە چاودێریی کۆمەڵایەتیو فێرکارییو خۆشگوزەرانی ، کە ملیشدەنێت بۆ جوانکاریەکان و ، ئاداب و هونەریش، ئەمانە هەمووی دەگرێتەوە.
ئینجا دوای ئەوە وا دەردەکەوێت کە زاراوەی گەشە، زۆر قۆناغی پینەکردنی بڕیووە بۆ ئەوەی ئامانجە نوێکان بگرێتەوە ،لەگەڵ ئەوەشدا زاراوەکە بەندە بە مەبەستە ماددیە سنووردارو دنیاییەکانەوە ، نەگەیشتۆتە ئاستی چەمکی ئیسلامییو قوڵیەکەیو گشتگیریەکەی.

## ڕێبازی ئیسلام

بەڵام ئاوەدانکردنەوە (العمران)* لە چوارچێوەی بیری ئیسلامیدا ،پەلدەهاوێژێت بۆ ئاسۆیەکی فراوانتر، نەك تەنها زیادبوونی بەرهەم و داهاتی نەتەوە ، یا ڕاستکردنەوەی پەیکەریی(هیکلی) لە بونیادی ئابووریداو، خۆی دەگەێنێتە دیاریکردنی ئامانجەکانی ژیان و پەیامی ئادەمیزاد لە ئاوەدانکردنەوەی زەویدا، لە ڕوانگەی ئەو مەبەستەی ئادەمیزادی لە پێناودا دروستکراوە،ئەویش بەندایەتیە بۆ خوای تاك و تەنها، چونکە لە ڕوانگەی موسڵمانەوە ، بەبێ یەکتاپەرستی ، ناتوانین وێنای ئاوەدانکردنەوەی زەوی بکەین. ئینجا بەپێی ئەو دیدە ئیسلامیە ، یا ئەو ڕێبازە ئیسلامیە ، تەنها ئابووریو خۆشگوزەرانی ئابووری ، تەوەرو خولگەی ژیانی مرۆڤایەتی ئامانجی بەرزی مرۆڤ نین، کە پێداویستەکانی تاکەکان و کۆمەڵگاش لەوێدا دەوەستێ، بەڵام ئابووریو پەرەپێدان دەبن بەو بەشەی کە مامەڵەو پەیوەندییە مادیەکانی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگا ڕێکدەخەن، کە

---

* ئەم بەراوردە مەبەستی ورووژاندنی جەنگی زاراوەکان نیە ،ئەوەندەی مەبەستی ڕوونکردنەوەی پرۆگرامی ئیسلامە لە چارەسەری کێشە ئابووریەکاندا

ڕانەوەستاون لە سەر هەندێ لە لایەنە پیادەکراوەکانی پەرەپێدان لە مێژووی ئیسلامداو،کاریگەریی لەسەر بنیاتنانی نمونەی پەرەپێدانی ئیسلامیی، چونکە ئەوان–بەخێرایی–چەمکی ئاوەدانکاریان(العمران) تێپەڕاند، بۆ وتووێژ لەسەر پەرەپێدان لە چوارچێوەیەکدا، نزیك بێت لەچەمکی خۆرئاوایی هاوچەرخ...

فەرمانی سێیەم، ئەوان بە ڕوونی پەیوەندی نێوان چەمکی ئیسلامیی پەرەپێدان و،ئەو شێوازە هونەریەی(چەمکەکە)دادەبەزێنێتە سەر واقیعی کۆمەڵگای هاوچەرخ، دیاریی نەکردووە، لەبەر ئەوە زاراوەی (ئاوەدانکردنەوەی مرۆیی )کە ئیبن خەلدون بەکاریهێناوە ، هەڵوێستەیەکی پێکردم ، ئەو زاراوەیە کە خەریکە دەبێتە هاوتا بۆ دەستەواژەی (ژیاری مرۆڤایەتی) یان (ژیارەکان). بەڵام ئیبن خەلدون ئەو دەستەواژەیەی لە جێگای تریشدا بەکارهێناوە بە واتای گەشەو پەرەپێدان و فرەیی‌و، چاکیی خەڵکی بە نەشونمای سامان و پاکبوونەوەی ...بە دانانی بە لایەنێك لە لایەنەکانی ژیار یا کۆبوونەوەی مرۆیی.[43]

لە سەرەتای ئەم باسەدا دیمان چۆن زاراوەی ((گەشە)) گۆڕا بۆ ((پەرەپێدان))، بۆ ئەوەی دەربڕی ناوەرۆکێکی فراوانتر بێت لە گەشە، ئینجا وشەی ((پەرەپێدان))، خۆیشی ملکەچکرا بۆ گۆڕانکاریی زیاتر، بۆ زیادکردنی ڕەهەندی نوێی بۆ بیرۆکەکە هەتا بوو بە ((پەرەپێدانی ئابووری))، ئینجا بوو بە ((پەرەپێدانی ئابووری کۆمەلأیەتی))Cocio Economic Development، دوای ئەوەی وشەی ((گەشە))تەنها مانای زیادبوونی داهاتی نەتەوەی دەدا بەدەستەوە ،بەهۆی ئەو گۆڕانکاریانەوە ، لەو چەمکە پەڕیەوە بۆ ئەوەی مانای گەشەی گەورەو ، دادگەریی کۆمەلایەتی و پێشخستنی ژیانی ماددی ئادەمیزاد بگرێتەوە ، لەگەڵ ئەوەی

[43] ئیبن خەلدون لە ساڵی ١٣٣٢زاییینی لە تونس لەدایك بووە ، لەساڵی ١٤٠٦ لە قاهرە کۆچی دوایی کردووە(المقدمة ،تحقیق علی عبدالواحد وافی لجنة البیان العربی ط١ ١٩٥٧ج٢ص٧١٧

بەروبومێك ، بەڕاستی ئەوانە هەموویان بەڵگەن بۆ کەسێك کە بیربکاتەوە ،هەروەها شەوو ڕۆژو خۆرو مانگ و ئەستێرەکانی ژێربارکردووە بۆتان ،لە ڕاستیدا ئەوانە هەموویان بەڵگەی ڕاستن بۆ کەسانێك کە ئەقڵیان بخەنەکار . ﴿ وهو الذی سخر البحر لتأکلوا منه لحما طریا وتستخرجوا منه حلیة تلبسونها وتری الفلك مواخر فیه ولتبتغوا من فضله ولعلکم تشکرون﴾ النحل ١٤ هەر ئەو خوایەیە دەریای ژێربار کردووە بۆتان کە بخۆن لەوگۆشتە تەڕەی کە تیایەتی ،گەهەری لێدەربهێنن خۆتانی پێبڕازێننەوە هەروەها دەبینی کەشتیەکان دەریاکان لەتدەکەن ،تا لە بەخششی پەروەردگار بەهرەمەند بن بەڵکو سوپاسگوزاربن.

ئەو هەموو دەرامەتە ژێربارکراوانە، لە پێداویستەکانی ئاوەدانکردنەوەی بەردەستی ئادەمیزادن، ئەوەش —وەکو لە ئایەتەکاندا بۆمان دەردەکەوێت—دەرامەتێکن جیادەکرێنەوە بە جۆراوجۆریەکی زۆر سەیرو ، خێروبێرێکی بێسنوور :زەوی ، شیوودۆڵ،ڕێگاکان، (خواردن خواردنەوە ، نیشتنگا، جلوبەرگ) بۆ بەکاربردن و بەرهەمهێنان و گەشت و گواستنەوە، هەروەها جوانیو ڕازاندنەوەو خۆشیی.ئەمانە هەمووی ژێربارکراوە بۆ ئادەمیزاد، بۆ ئەوەی عەقڵ ودڵی خۆی تێدا بخاتەکار، بیروهۆشی بەکاربێنێ، ئینجا بەدەست و توانا جەستەییو بیریەکانی ایّبخاتەکار، بۆ ئاوەدانکردنەوەو بنیاتنان و چاکسازیی، بەهیوای ئەوەی خوای گەورە ئەودنیاشی پێببەخشێت، بەڵام بەشی ئەم دنیاشی لەبیرنەچێت.

ئالێرەدا سروشتی بۆچوونی ئیسلام و ،پێوەرە وردە هاوسەنگەکانمان بۆ دەردەکەوێت، نەك تەنها ئەوەندەی پەیوەندی بە کێشەی پەرەپێدانەوە هەیەوبەس، بەڵکو ئەوەی کە دەست بۆ هەموو لایەکی ژیان دەکێشێت.

هەموویان دەیگرنەبەر لە پێڕەوێکدا ، بگاتە ئەنجامدانی پەیامی مرۆڤ لەسەر ئەم زەویە، کە خواپەرستیو بەندایەتیە بۆ خوای گەورە.[44]

بە دەستەواژەیەکیتر ئابووری ئیسلام بەشێکە لە هەموویەك کە پێکەوە بەستراوەو، بەرێکیو بە هاوسەنگی کارلێکدەکات لەگەڵ بەشەکانیتری پێکهاتەی ئیسلام [45]

لەچوارچێوەی ئەو بۆچوونە روونەدا، رۆڵی ئادەمیزاد دێت لە ئاوەدانکردنەوەی سەرزەوی، بەو سامانە سروشتیانەی کە تێیدایەو، بەو زانست و تایبەتمەندو توانایانەی خوا پێیبەخشیون، هەروەها بە ژێربارکردنی هەموو دروستکراوەکانیتر بۆ ئادەمیزاد: ﴿ هو الذی انشأكم من الارض واستعمركم فيها فاستغفروه ثم توبوا اليه ان ربی قريب مجيب﴾ هود٦١ ئەو خوایەیە کە ئێوەی لە زەوی پەیدا کردووە لەوێش ئاوەدانی پیٚ دروستکردوون دە داوای لێخۆشبوونی لێبکەن و پەشیمان ببنەوە ،لە راستیدا پەروەردگارم نزیکەو وەڵامیشتان دەداتەوە. ﴿ هو الذی انزل من السماء ماء لكم منه شراب ومنه شجر فيه تسيمون ينبت لكم به الزرع والزيتون والنخيل والاعناب ومن كل الثمرات ان فی ذلك لاية لقوم يتفكرون، وسخر لكم الليل والنها ر والشمس والقمر والنجوم مسخرات بامره ان فی ذلك لقوم يذكرون﴾النحل١٠-١٢ واتە خوا ئەو زاتەیە کە لە ئاسمانەوە بارانتان بۆ دەبارێنێت ،لێی دەخۆنەوە ،درەختی پێدەروێت ،ماڵیاتی پیٚ دەلەوەڕێنن ،بەو بارانە جۆرەها کشتوکاڵ دێتە بەرهەم ،لە ناویاندا زەیتون و خورماو تریٚ ،لە هەموو جۆرە

---

[44] محمود ابو سعود ،اثر تطبيق النظام الاقتصادی الاسلامی فی المجتمع ،جامعة الامام محمد بن سعود الاسلامية ،القسم الرابع ،المجلس العلمی (١٧)الرياض ١٤٠٤ه ص٣٨٢

[45] عبد الحميد الغزالی ، اساسيات المنهج الاسلامی فی التنمية الاقتصادية ،مركز الاقتصاد ،المصرف الاسلامی الدولی للاستثمار والتنمية ،ادارة البحوث ،الرسالة للطباعة والنشر ،القاهرة ١٩٨٨ص٧

بەروبومێك ، بەڕاستی ئەوانە هەموویان بەڵگەن بۆ کەسێك کە بیربکاتەوە ،هەروەها شەوو ڕۆژو خۆرو مانگ و ئەستێرەکانی ژێربارکردووە بۆتان ،لە ڕاستیدا ئەوانە هەموویان بەڵگەی ڕاستن بۆ کەسانێك کە ئەقڵیان بخەنەکار . ﴿ وهو الذي سخر البحر لتأكلوا منه لحما طريا وتستخرجوا منه حلية تلبسونها وترى الفلك مواخر فيه ولتبتغوا من فضله ولعلكم تشكرون﴾النحل ١٤ هەر ئەو خوایەیە دەریای ژێربار کردووە بۆتان کە بخۆن لەوگۆشتە تەڕەی کە تیایەتی ،گەهەری لێدەربهێنن خۆتانی پێبڕازێننەوە هەروەها دەبینی کەشتیەکان دەریاکان لەتدەکەن ،تا لە بەخششی پەروەردگار بەهرەمەند بن بەڵکو سوپاسگوزاربن.

ئەو هەموو دەرامەتە ژێربارکراوانە، لە پێداویستەکانی ئاوەدانکردنەوەی بەردەستی ئادەمیزادن، ئەوەش –وەکو لە ئایەتەکاندا بۆمان دەردەکەوێت–دەرامەتێکن جیادەکرێنەوە بە جۆراوجۆریەکی زۆر سەیرو ، خێروبێرێکی بێسنوور :زەوی ، شیوودۆڵ،ڕێگاکان، (خواردن خواردنەوە ، نیشتنگا، جلوبەرگ) بۆ بەکاربردن و بەرهەمهێنان و گەشت و گواستنەوە، هەروەها جوانیو ڕازاندنەوەو خۆشیی.ئەمانە هەمووی ژێربارکراوە بۆ ئادەمیزاد، بۆ ئەوەی عەقڵ ودڵی خۆی تێدا بخاتەکار، بیروهۆشی بەکاربێنێ، ئینجا بەدەست و توانا جەستەیىو بیریەکانی لێبخاتەکار، بۆ ئاوەدانکردنەوەو بنیاتنان و چاکسازیی، بەهیوای ئەوەی خوای گەورە ئەودنیاشی پێببەخشێت، بەڵام بەشی ئەم دنیاشی لەبیرنەچێت.

ئالێرەدا سروشتی بۆچوونی ئیسلام و ،پێوەرە وردە هاوسەنگەکانمان بۆ دەردەکەوێت، نەك تەنها ئەوەندەی پەیوەندی بە کێشەی پەرەپێدانەوە هەیەوبەس، بەڵکو ئەوەی کە دەست بۆ هەموو لایەکی ژیان دەکێشێت.

هەموویان دەیگرنەبەر لە پێڕەوێکدا ، بگاتە ئەنجامدانی پەیامی مرۆڤ لەسەر ئەم زەویە، کە خواپەرستیو بەندایەتیە بۆ خوای گەورە.[44]

بە دەستەواژەیەکیتر ئابووری ئیسلام بەشێکە لە هەموویەك کە پێکەوە بەستراوەو، بەرێکیو بە هاوسەنگی کارلێکدەکات لەگەڵ بەشەکانیتری پێکهاتەی ئیسلام [45]

لەچوارچێوەی ئەو بۆچوونە روونەدا، رۆڵی ئادەمیزاد دێت لە ئاوەدانکردنەوەی سەرزەوی، بەو سامانە سروشتیانەی کە تێیدایەو، بەو زانست و تایبەتمەندو توانایانەی خوا پێیبەخشیون، هەروەها بە ژێربارکردنی هەموو دروستکراوەکانیتر بۆ ئادەمیزاد: ﴿ هو الذی انشأکم من الارض واستعمرکم فیها فاستغفروه ثم توبوا الیه ان ربی قریب مجیب﴾ هود٦١ ئەو خوایەیە کە ئێوەی لە زەوی پەیدا کردووە لەوێش ئاوەدانی پێ دروستکردوون دە داوای لێخۆشبوونی لێبکەن و پەشیمان ببنەوە ،لە راستیدا پەروەردگارم نزیکەو وەڵامیشتان دەداتەوە. ﴿ هو الذی انزل من السماء ماء لکم منه شراب ومنه شجر فیه تسیمون ینبت لکم به الزرع والزیتون والنخیل والاعناب ومن کل الثمرات ان فی ذلك لایة لقوم یتفکرون، وسخر لکم اللیل والنها ر والشمس والقمر والنجوم مسخرات بامره ان فی ذلك لقوم یذکرون﴾النحل١٠-١٢ واتە خوا ئەو زاتەیە کە لە ئاسمانەوە بارانتان بۆ دەبارێنێت ،لێی دەخۆنەوە ،درەختی پێدەڕوێت ،ماڵیاتی پیێ دەلەوەڕێنن ،بەو بارانە جۆرەها کشتوکاڵ دێتە بەرهەم ،لە ناویاندا زەیتون و خورماو تریێ ،لە هەموو جۆرە

---

[44] محمود ابو سعود ،اثر تطبیق النظام الاقتصادی الاسلامی فی المجتمع ،جامعة الامام محمد بن سعود الاسلامیة ،القسم الرابع ،المجلس العلمی (١٧) الریاض ١٤٠٤ه ص٢٨٣

[45] عبد الحمید الغزالی ، اساسیات المنهج الاسلامی فی التنمیة الاقتصادیة ،مرکز الاقتصاد ،المصرف الاسلامی الدولی للاستثمار والتنمیة ،ادارة البحوث ،الرسالة للطباعة والنشر ،القاهرة ١٩٨٨ص٧

ژیاریی که موسڵمانەکان پیادەیان کردووە لە سەردەمەکاندا ، لە سنووری پابەندبوون بە ڕێنماییەکانی ئیسلام و شەرعەوە.

## نمونەی ئیسلامیی

لەبەرئەوەی ئادەمیزاد تەوەرەی ئاوەدانکردنەوەو هێزی بزوێنەریەتی –بەحوکمی جێنشینیی لەسەر زەویدا–، کەواتە ئەنجامدانی بەرپرسیارێتی خۆی لە ئاوەدانکردنەوەی زەویدا، بە هاندەری بیروباوەڕوبەهاکان و ئەو پێوەرانەی لێی پەیدابووە ، بریتیە لە گرنگترین تایبەتمەندی نمونەی ئیسلامیی پەرەپێدان، ئەم بەرپرسیارێتیەش پشت ئەستوورە بە ڕێکیەکی بێوێنە ، لە نێوان رۆح و ماددەدا ، لەنێوان دروشم و یاساکاندا ، لەنێوان تاك و کۆمەڵدا، لەنێوان دنیاو قیامەتدا[46] چونکە بەرپرسیارێتیەکی تریش رووی تێدەکات، ئەویش پرسیاری رۆژی قیامەتە(عن عمره فيم افناه ، وعن علمه ماعمل به ، وعن ماله من اين اكتسبه وفيم انفقه ، وعن جسمه فيم ابلاه. ) واتە پرسیار لە تەمەنی دەکرێت لە چیدا سەرفی کردووە ,لە زانستیەو ئەو کارەی پێی ئەنجامداوە،لە سامانی لەکوێوە بەدەستی هێناوە و لە چیدا خەرجی کردووە،لە جەستەی لە چیدا بەکاریهێناوە,.

ئەم بۆچوونە قووڵە گشتگیرەی پەیامی ئادەمیزاد لەسەر زەوی ،کە ڕێبازە ئابووریە مرڤکردە نوێکان رەتیان کردۆتەوەو، زیادکردنی بەرهەم و خۆشگوزەرانیەو رابواردنی ژیانی دنیایان کردۆتە ئامانجی بنەڕەتی کە خۆی مەبەستە [47]،بەوەی کە

---

[46]عبد الحميد الغزالي ،اساسيات المنهج الاسلامي في التنمية للاقتصادية ،مصدر سابق ص١٢

[47] George Soule Ideas of the great economisits ,a mentor book ,New York ,1960.pp.31,(Now the emohasis shifted to the improvement of life on earth for its own sake .)

لەبواری پەرەپێدان وئاوەدانکردنەوەدا ، پرۆسەی بەرهەمهێنان وگەشەی سامان و ، پیادەکردنی دادگەریی‌و چاکسازیی و ، دوورکەوتنەوە لە خراپەکاریی‌و، ستەم، پەیوەندیەکی بەهێزی هەیە بە بیروباوەڕو، شەرع و خواپەرستیی‌و مامەڵەو بەهاو رەفتارەوە.

## ئامانج و هۆکارەکان

لەراستیدا زانایانی ئیسلام و فەقیهەکانی -پێش سەرهەڵدانی ئەوەی ناونراوە ئابووری سیاسی-چاکەی پێشکەوتنیان هەیە،لە روونکردنەوەی سروشتی پرۆسەی بەرهەمهێنان و، کاریگەریی دابەشکردنی کارو خەرجیە گشتیەکان(خەرجیەکانی دەوڵەت)و پاشەکەوتەکان، بۆ بەدەستهێنانی گەشەو پێشکەوتنی ئابووری بەپێی بۆچوونی ئیسلام،بەمەش بەروونی جیاوازیان کردووە ، لەنێوان مەبەستەکانی ئاوەدانکردنەوەو ئامانجە گەورەکانیدا و (تێڕوانینی مەزهەبیی)، لە نێوان ئامرازە ماددیی‌و تەکنۆلۆژیی‌و هونەریەکان، کە هاوکاری دەکەن لە گەشەکردندا.

راستە ئەوان ئەم زاراوانەیان بەکارنەهێناوە،وەکو ئاستی ژیان و بەرهەمهێنانی نەتەوەو تێکڕای پاشەکەوت و، وەبەرهێنان وگەشەو دانەی سەرمایە، بەڵام دەستەواژەی وایان بەکارهێناوە، کە ئەو چەمکانە بگەیێنیٚ بەزمانی سەردەمی خۆیان، ئەوە سەرەڕای ئەوەی زۆر لەو زاراوانەو دەربڕینیان، لە شێوەی ژمارەو وێنەی روونکردنەوەو (الرسم البیانی) نمونەی بیرکاریدا، لە راستیدا دەربڕی هەندیٚ وەسیلەیٚ هونەریی‌و تەکنۆلۆژی بۆ بەئەنجام گەیاندنی پەرەپێدان دەگەیێنیٚ، نەك ئەوانە خۆیان پەرەپێدان بن . ئینجا مادام ئەوانە وەسیلەیەکی رووتن ، موسڵمان هیچ نەنگیەکی تێدانابینیٚ کە مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، بە پشتبەستن بە رێسای (جلب المصالح ودرء المفاسد) . مێژووی ئیسلامیش پڕیەتی لە وێنەی کراوەیی

ژیاریی کە موسڵمانەکان پیادەیان کردووە لە سەردەمەکاندا ، لە سنووری پابەندبوون بە رێنماییەکانی ئیسلام و شەرعەوە.

## نمونەی ئیسلامیی

لەبەرئەوەی ئادەمیزاد تەوەرەی ئاوەدانکردنەوەو هێزی بزوێنەریەتی -بەحوکمی جێنشینیی لەسەر زەویدا-، کەواتە ئەنجامدانی بەرپرسیارێتی خۆی لە ئاوەدانکردنەوەی زەویدا، بە هاندەری بیروباوەڕوبەهاکان و ئەو پێوەرانەی لێی پەیدابووە ، بریتیە لە گرنگترین تایبەتمەندی نمونەی ئیسلامیی پەرەپێدان، ئەم بەرپرسیارێتیەش پشت ئەستوورە بە رێکیەکی بێوێنە ، لە نێوان رۆح و ماددەدا ، لەنێوان دروشم و یاساکاندا ، لەنێوان تاك و کۆمەڵدا، لەنێوان دنیاو قیامەتدا[46] چونکە بەرپرسیارێتیەکی تریش رووی تێدەکات، ئەویش پرسیاری رۆژی قیامەتە(عن عمره فیم افناه ، وعن علمه ماعمل به ، وعن ماله من این اکتسبه وفیم انفقه ، وعن جسمه فیم ابلاه. ) واتە پرسیار لە تەمەنی دەکرێت لە چیدا سەرفی کردووە ,لە زانستیو ئەو کارەی پێی ئەنجامداوە،لە سامانی لەکوێوە بەدەستی هێناوە و لە چیدا خەرجی کردووە،لە جەستەی لە چیدا بەکاریهێناوە,.

ئەم بۆچوونە قووڵە گشتگیرەی پەیامی ئادەمیزاد لەسەر زەوی ،کە رێبازە ئابووریە مرڤکردە نوێکان رەتیان کردۆتەوەو، زیادکردنی بەرهەم و خۆشگوزەرانیو رابواردنی ژیانی دنیایان کردۆتە ئامانجی بنەڕەتی کە خۆی مەبەستە [47]،بەوەی کە

---

(46) عبد الحمید الغزالی ،اساسیات المنهج الاسلامی فی التنمیة للاقتصادیة ،مصدر سابق ص١٢

(47) George Soule Ideas of the great economisits ,a mentor book ,New York ,1960.pp.31,(Now the emohasis shifted to the improvement of life on earth for its own sake .)

لەبواری پەرەپێدان وئاوەدانکردنەوەدا ، پرۆسەی بەرهەمهێنان وگەشەی سامان و ، پیادەکردنی دادگەریی‌و چاکسازیی و ، دوورکەوتنەوە لە خراپەکاریی‌و، ستەم، پەیوەندیەکی بەهێزی هەیە بە بیروباوەڕو، شەرع و خواپەرستیی‌و مامەڵەو بەهاو رەفتارەوە.

## ئامانج و هۆکارەکان

لەراستیدا زانایانی ئیسلام و فەقیهەکانی –پێش سەرهەڵدانی ئەوەی ناونراوە ئابووری سیاسی–چاکەی پێشکەوتنیان هەیە،لە روونکردنەوەی سروشتی پرۆسەی بەرهەمهێنان و، کاریگەریی دابەشکردنی کارو خەرجیە گشتیەکان(خەرجیەکانی دەوڵەت)و پاشەکەوتەکان، بۆ بەدەستهێنانی گەشەو پێشکەوتنی ئابووری بەپێی بۆچوونی ئیسلام،بەمەش بەروونی جیاوازیان کردووە ، لەنێوان مەبەستەکانی ئاوەدانکردنەوەو ئامانجە گەورەکانیدا و (تێڕوانینی مەزهەبیی)، لە نێوان ئامرازە ماددیی‌و تەکنۆلۆژیی‌و هونەریەکان، کە هاوکاری دەکەن لە گەشەکردندا.

راستە ئەوان ئەم زاراوانەیان بەکارنەهێناوە،وەکو ئاستی ژیان و بەرهەمهێنانی نەتەوەو تێکڕای پاشەکەوت و، وەبەرهێنان وگەشەو دانەی سەرمایە، بەڵام دەستەواژەی وایان بەکارهێناوە، کە ئەو چەمکانە بگەیێنێ بەزمانی سەردەمی خۆیان، ئەوە سەرەڕای ئەوەی زۆر لەو زاراوانەو دەربڕینیان، لە شێوەی ژمارەو وێنەی روونکردنەوەو (الرسم البیانی) نمونەی بیرکاریدا، لە راستیدا دەربڕی هەندێ وەسیلەی هونەریی‌و تەکنۆلۆژی بۆ بەئەنجام گەیاندنی پەرەپێدان دەگەیێنێ، نەك ئەوانە خۆیان پەرەپێدان بن . ئینجا مادام ئەوانە وەسیلەیەکی رووتن ، موسڵمان هیچ نەنگیەکی تێدانابینێ کە مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، بە پشتبەستن بە رێسای (جلب المصالح ودرء المفاسد) . مێژووی ئیسلامیش پڕیەتی لە وێنەی کراوەیی

قورساییەکانی ژیانی دنیا ئاسان دەبێت، ئینجا تەواوکاریەکان[51]، ئەویش ئەو نیعمەتانەیەکە ژیانی ئادەمیزادیان پیَ تێروتەسەل دەبێت.بۆ جەختکردنەوە لەسەر بەرهەم و، فەراهەمهێنانی خۆراك بەتایبەتی ، دەبینین ئیبن خەلدون لێکۆڵینەوەکەی لەسەر ئاوەدانکردنەوەی مرۆیی، بەباسکردنی بەرهەمهێنانی خۆراك دەست پێکردووە، (روونکردنەوەی ئەوەی کە خوای گەورە ئادەمیزادی دروستکردووە ، بەشێوەیەك دروستیکردووە کە ژیان و مانەوەی نابێت بەبیَخواردن ، بۆیە رێنمایی کردووە کە هەر بە فیترەت، بەو توانایەی کە –لە مرۆڤدا دروستیکردووە ، هەوڵ بدات بۆ بەدەستهێنانی ، بەلام توانای یەك کەس لەوە کەمترە کە بتوانێت هەموو پێویستیە خۆراکیەکانی بەدەست بینی کە بەسبن بۆ ژیانی[52]

ئینجا نمونەیەك دەهێنێتەوە :خواردنی یەك رۆژ لە دانەوێڵە بە هاوکاریی ژمارەیەك پسپۆڕ نەبێت بەدەست نایەت ، هەر پسپۆڕیەك لەوانەش بەدەست نایەت بە ئامرازی ماددی بەرهەمهێنان نەبێت( ئامێرو دەفرەکان، ئەو ئامێرانەش تەواو نابن بە پیشەسازیی جیاجیاو تایبەت نەبێت( ئاسنگەر، دارتاش، فەخفوریساز،..)،با کشتوکاڵ و درەوو پاککردنی دانەوێڵەش بوەستیَ، کە هەریەکە لەم ئامێرە جیاجیایانە زۆرترن لە پێشووەکان، ئەستەمە کە توانای یەك کەس ئەم هەموو شتانە فەراهەم بهێنێت ، کەوابوو چارنییە دەبیَ زۆرێك لە هاورەگەزەکانی کۆببنەوە، بۆ بەدەستهێنانی خۆراك بۆ ئەوو بۆ خۆشیان ، بەو شێوەیە بە هاوکاریکردن پێداویستی پێویست بۆ زۆرتر لە خۆیان بە چەندجارە بەدەست دێت. [53]

لەو دەستەواژە وردە کورتانەدا، ئیبن خەلدون پرۆسەی بەرهەمهێنان و کاریگەریی بۆ پەرەپێدان کورت کردۆتەوەو ، بایەخیداوە بە ئامرازەکانی

---

[51] محمد عبد المنعم عفر ،نحو النظرية الاقتصادية فى الاسلام ،مطبوعات الاتحاد الدولى للبنوك الاسلامية ١٩٨١ص٢٩٨

[52] المقدمة ج١ ص١٧٢

[53] هەمان سەرچاوە ل:٢٧٢-٢٧٣

دایانناوە کۆمەڵگای نویٚ-بەسەرمایەداریو سۆشیالیستیىیەوە-لە سەردەمی زانستایەو،لە تەفسیری ئایینی بۆ رەفتاری ئادەمیزاد تێپەڕیوە.

یاساکانی سروشت -نەك ئیرادەی خوا وەکو رێبازە لاهوتیەکان وایدەناسن- تەفسیری رەفتارەکانی مرۆۋ دەکەن، عەقڵ-نەك بیروباوەڕێکی ئایینی-رێنمایی مرۆۋ دەکات[48] لەم قسانەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت ، کە جیاوازیی بنەڕەتی لە نێوان بۆچوونی ئیسلامیىو ، بۆچوونی بێدینی خۆرئاوا ، لەسەر ئامرازە تەکنۆلۆژیەکانی زیادکردنی بەرهەم و ،بەدەستهێنانی تێکڕای بەرزتری گەشەی ئابووری نییە ، بەڵکو لەسەر ئاراستەو ئامانجەکانە ، ئاراستەی کۆمەڵگای بێدین رەهەندی غەیبی رەتدەکاتەوەو ، شتی چاك دەگۆڕێتەوە بە شتی خراپ و نزمتر.

کەوابوو لەبەرئەوەی ئادەمیزاد بەرپرسیارە لە تەمەنیو زانستیو جەستەیو سەرچاوەکانی داهاتیو بوارەکانی خەرجکردنی، بۆ ئەو مەبەستە نمونەی ئیسلامیی گەشە ئاراستەیەو بەبۆچوون زانستیەو ، ناوەرۆك جیهانی و کراوەیی بیرەو، [49] لەوەشدا رەچاوی دانایی گشتییو رەچاوکردنی شەرع و هەموو مەبەستە زەروریەکانی شەرعی کردووە کە پێنجن: پاراستنی ئایین، خود ، ئەقڵ، وەچە ، سامان[50]

ئەمانە کارە لەپێشترەکانی پەرەپێدانن لە دیدی ئیسلامەوە ، بەدەستهێنانی ئەو مەبەستانەش ، واتە بایەخدان بە بەرهەم و خستنەکاری دەرامەتەکان، مامناوەندیىبوون لە خەرجکردنداو دوورکەوتنەوە لە دەستبلاَوی،خۆپسپۆڕکردن لە کاردا، ئامادەکردنی پێویستیە زەروریەکان بۆ هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا. ئینجا دوای ئەوە پێویستیە گرنگە پلە دووەکان دێت ئەو پێداویستانەی کە هاوڕیٚ لەگەڵیاندا

---

(48) G.soule ,Op.cit.p.31

(49) عبد الحميد الغزالي ،المصدر السابق ص١٠

(50) ابن خلدون ،المقدمة ،تحقيق علي عبد الواحد وافي ،مصدر سابق ج٢ ،ص٦٨٢

قورساییەکانی ژیانی دنیا  ئاسان دەبێت، ئینجا تەواوکاریەکان[51]، ئەویش ئەو نیعمەتانەیەکە ژیانی ئادەمیزادیان پیٚ تێروتەسەل دەبێت.بۆ جەختکردنەوە لەسەر بەرهەم و، فەراهەمهێنانی خۆراك بەتایبەتی ، دەبینین ئیبن خەلدون لێکۆڵینەوەکەی لەسەر ئاوەدانکردنەوەی مرۆیی، بەباسکردنی بەرهەمهێنانی خۆراك دەست پێکردووە، (روونکردنەوەی ئەوەی کە خوای گەورە ئادەمیزادی دروستکردووە ، بەشێوەیەك دروستیکردووە کە ژیان و مانەوەی  نابێت بەبیٚخواردن ، بۆیە رێنمایی کردووە کە هەر بە فیترەت، بەو توانایەی کە —لە مرۆڤدا دروستیکردووە ، هەوڵ بدات بۆ بەدەستهێنانی ، بەلام توانای یەك کەس لەوە کەمترە کە بتوانێت هەموو پێویستیە خۆراکیەکانی بەدەست بینی کە بەسبن  بۆ ژیانی[52]

ئینجا نمونەیەك دەهێنێتەوە :خواردنی یەك رۆژ لە دانەوێڵە  بە هاوکاریی ژمارەیەك پسپۆڕ نەبێت بەدەست نایەت ، هەر پسپۆڕیەك لەوانەش بەدەست نایەت بە ئامرازی ماددی بەرهەمهێنان نەبێت( ئامێرو دەفرەکان، ئەو ئامێرانەش تەواو نابن بە پیشەسازیی جیاجیاو تایبەت نەبێت( ئاسنگەر، دارتاش، فەخفوریساز،..)،با کشتوکاڵ و درەوو پاککردنی دانەوێڵەش بوەستیٚ، کە هەریەکە لەم ئامێرە جیاجیایانە زۆرترن لە پێشووەکان، ئەستەمە کە توانای یەك کەس ئەم هەموو شتانە فەراهەم بهێنێت ، کەوابوو چارنییە دەبیٚ زۆرێك لە هاورەگەزەکانی کۆببنەوە، بۆ بەدەستهێنانی خۆراك بۆ ئەوو بۆ خۆشیان ، بەو شێوەیە بە هاوکاریکردن پێداویستی  پێویست بۆ زۆرتر لە خۆیان  بە چەندجارە بەدەست دێت. [53]

لەو دەستەواژە وردە کورتانەدا، ئیبن خەلدون پرۆسەی بەرهەمهێنان و کاریگەریی بۆ پەرەپێدان کورت کردۆتەوەو ، بایەخیداوە بە ئامرازەکانی

---

[51] محمد عبد المنعم عفر ،نحو النظرية الاقتصادية فى الاسلام ،مطبوعات الاتحاد الدولى للبنوك الاسلامية ١٩٨١ص٢٩٨

[52] المقدمة ج١ ص١٧٢

[53] هەمان سەرچاوە ل:٢٧٢–٢٧٣

دایاننا‌وە کۆمەڵگای نویٚ-بەسەرمایەداری‌و سۆشیالیستی‌یەوە-لە سەردەمی زانستایەو،لە تەفسیری ئایینی بۆ رەفتاری ئادەمیزاد تێپەڕیوە.

یاساکانی سروشت -نەك ئیرادەی خوا وەکو رێبازە لاهوتیەکان وایدەناسن- تەفسیری رەفتارەکانی مرۆڤ دەکەن، عەقڵ-نەك بیروباوەڕێکی ئایینی-رێنمایی مرۆڤ دەکات[48] لەم قسانەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت ، کە جیاوازیی بنەڕەتی لە نێوان بۆچوونی ئیسلامیی‌و ، بۆچوونی بێدینی خۆرئاوا ، لەسەر ئامرازە تەکنۆلۆژیەکانی زیادکردنی بەرهەم و ،بەدەستهێنانی تێکڕای بەرزتری گەشەی ئابووری نییە ، بەڵکو لەسەر ئاراستەو ئامانجەکانە ، ئاراستەی کۆمەڵگای بێدین رەهەندی غەیبی رەتدەکاتەوەو ، شتی چاك دەگۆڕێتەوە بە شتی خراپ و نزمتر.

کەوابوو لەبەرئەوەی ئادەمیزاد بەرپرسیارە لە تەمەنی‌و زانستی‌و جەستەی‌و سەرچاوەکانی داهاتی‌و بوارەکانی خەرجکردنی، بۆ ئەو مەبەستە نمونەی ئیسلامیی گەشە ئاراستەیەو بەبۆچوون زانستیەو ، ناوەرۆك جیهانی و کراوەیی بیرەو، [49] لەوەشدا رەچاوی دانایی گشتیی‌و رەچاوکردنی شەرع و هەموو مەبەستە زەروریەکانی شەرعی کردووە کە پێنجن: پاراستنی ئایین، خود ، ئەقڵ، وەچە ، سامان[50]

ئەمانە کارە لەپێشترەکانی پەرەپێدانن لە دیدی ئیسلامەوە ، بەدەستهێنانی ئەو مەبەستانەش ، واتە بایەخدان بە بەرهەم و خستنەکاری دەرامەتەکان، مامناوەندی‌بوون لە خەرجکردنداو دوورکەوتنەوە لە دەستبلاْوی،خۆپسپۆڕکردن لە کاردا، ئامادەکردنی پێویستیە زەروریەکان بۆ هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا. ئینجا دوای ئەوە پێویستیە گرنگە پلە دووەکان دێت ئەو پێداویستانەی کە هاوڕێ لەگەڵیاندا

---

[48] G.soule ,Op.cit.p.31

[49] عبد الحميد الغزالي ،المصدر السابق ص١٠

[50] ابن خلدون ،المقدمة ،تحقيق علي عبد الواحد وافي ،مصدر سابق ج٢ ،ص٦٨٢

سەربەرزیی تیا جێگیر دەبێت، دەبا کۆکراوەی خەزنەکانت خەرجکردنی سامان بێت لە ئاوەدانکردنەوەی ئیسلام و خەڵکەکەی [55]

ئەم چەمکە تا رادەیەکی زۆر دەگونجێت لەگەڵ ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەڵێن ( وەبەرهێنان و خەرجیە گشتیەکان). زانایانی ئیسلام زانیویانە کە دەوڵەت بازاڕێکی گەورەیە ، دایکی بازاڕەکان هەموویان ، بناغەیان و ماددەیانە لە داهات و خەراجە- داهاتەکانی دەوڵەت و خەرجیەکانی- ئەگەر ئەو بازاڕە بێبازاڕیی تێکەوت و مەسرەفەکانی کەمبوویەوە ، ئەوکاتە بازاڕەکانیتر زۆر زیاتر تووشی ئەوە دەبن) [56]

وەبەرهێنان لە فقهی ئابووری ئیسلامدا ، چاوەڕێی داهاتی ماددیو کۆمەڵایەتی لێدەکرێت، کە کۆمەڵگا بەرهەمەکەی بدروێتەوە و ، شادیو خۆشگوزەرانیی دەستبکەوێت، بەڵام داهاتی وەبەرهێنان لەبۆچوونی ئیسلامدا لەوە گەورەترە ( بەڵێنی داوە بە خەرجکردنێك کە کاروباریان چاك بکات ، گوزەرانیان خۆشبکات ، ئینجا ئەگەر ئەو کارەت کرد ، نیعمەتت بۆ بڕیار دەدرێت و دەبیتە شیاوی خێری زیاتر لەلایەن خوای بەخشندەوە ، بەوشێوەیەش لەسەر وەرگرتنی باج و خەراجی هاوولاتیان بەتواناتر دەبێت.. لەراستیدا سامان ئەوەی لێدەمێنێتەوە کە لە ڕێی خوادا خەرجکراوە و لەڕێی راستی خۆیدا.. وریابە دنیاو خەڵەتاندنەکانی ،نارەحەتیەکانی قیامەتت لەبیر نەباتەوەو کەمتەرخەمیی بکەیت لەو مافانەی لەسەرتن، دەبا کارەکانت بۆ خوابن و چاوەڕێی پاداشت لەو بکە )[57]

هەروەها بناوانەکانی پەرەپێدان لە ئیسلامدا ، دووبارە لە چەمکی دەستکەوتی ماددیو کۆمەڵایەتیی تێدەپەڕێت بۆ ئاسۆی بەهاکان و رەوشت و رەفتارێك ، کە لە

---

(55) هەمان سەرچاوە ج٢،ص٦٧٩ لێرەدا دەردەکەوێتی کە ابن خەلدون لەپێش جۆن کینزەوە (١٨٨٣-١٩٥٦)ڕێی کەوتووە لە بیردۆزەی خەرجی گشتیی (حکومەت)سەیری ئەم کتێبە بکە: Michael Stewart ,Keynes and after Penguin Book ,2nd .Ed .1972,p.72

(56)

(57) هەمان سەرچاوە ،ل:٧٢٠

بەرهەمهێنان( وسائل الانتاج)و،دابەشکردنی کاری لە پێشخستنی کیفایەتی بەرهەمهێنان روون کردۆتەوە ، لێرەدا ئەوەمان مەبەست نییە کە پێشەوایەتیی لەو بوارەدا دەربخەین کە پێش ئادەم سمیس (١٧٢٣-١٧٩٠)کەوتووە بەچوار سەدە ، بەڵکو ئەوەی مەبەستمانە ئەوەیە کە پرۆسەی بەرهەمهێنان ، لەبیری زانایانی موسڵماندا ون نەبووە ، بەڵکو لە جێگای گونجاوی خۆیدا دایانناوە ، بەدانانی بەئامرازێکی ئاوەدانکردنەوەو مانەوەی جۆری مرۆڤ و پاراستنی ،بەوەش (بوونیان تەواو دەبێت و ئەو تەمەنەش کە خوای گەورە بۆی داناون و کردوونیە جێگر) [54]

ئینجا وەبەرهێنانی سامان و،بەگەڕخستنی وپاککردنەوەی (تزکیتها)، نەشو نماکردنی، بە خەرجکردنی لە بەرژەوەندی میللەتدا ، لەو خەرجکردنەش ئەوەی ئاراستە دەکرێت بۆ بەکاربردن-کە کارێکی زۆر گرنگە وەکو لە باسی خۆراکدا دیمان -،بەلام چەمکی ناسراو لای زانایانی شەرع ، ئەوەی کە سامان( بەخەرجکردنی گەشە دەکات و بە هەڵگرتنی کەمدەکات)، گومان لەوەدا ناهێڵێتەوە کە خەرجکراوی ئاراستە بۆ (ئاوەدانکردنەوەی ئیسلام و خەڵکەکەی ) ئەوە لە راستیدا خەرجکردنێکی وەبەرهێنان و بەکاربردنیشە لە هەمان کاتدا، بەپێی خواستی بەرژەوەندی ئوممەت،( ئەوەش بزانە سامان ئەگەر پاشەکەوت کرا و لە خەزنەدا هەڵگیرا ، گەشە ناکات، بەلام ئەگەر لەبەرژەوەندی هاوولاتیاندا بوو، مافی خۆی دانیو ئازاری لێهەڵگرتن، گەشەدەکات و پاکدەبێتەوە ,و خەڵکیشی بەگشتیی پیێ چاك دەبێت و ویلایەتیشی پیێ رێکدەخرێت و سەردەم خۆشدەبێت ، سوودو

[54] ابن خلدون ،المصدر نفسه ج١ ص٢٧٤

سەربەرزیی تیا جێگیر دەبێت، دەبا کۆکراوەی خەزنەکانت خەرجکردنی سامان بێت لە ئاوەدانکردنەوەی ئیسلام و خەڵکەکەی [55]

ئەم چەمکە تا رادەیەکی زۆر دەگونجێت لەگەڵ ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەڵێن ( وەبەرهێنان و خەرجیە گشتیەکان). زانایانی ئیسلام زانیویانە کە دەوڵەت بازاڕێکی گەورەیە ، دایکی بازاڕەکان هەموویان ، بناغەیان و ماددەیانە لە داهات و خەراجە- داهاتەکانی دەوڵەت و خەرجیەکانی- ئەگەر ئەو بازاڕە بێبازاڕیی تێکەوت و مەسرەفەکانی کەمبوویەوە ، ئەوکاتە بازاڕەکانیتر زۆر زیاتر تووشی ئەوە دەبن) [56]

وەبەرهێنان لە فقهی ئابووری ئیسلامدا ، چاوەڕێی داهاتی ماددیو کۆمەلایەتی لێدەکرێت، کە کۆمەڵگا بەرهەمەکەی بدروێتەوە و ، شادیو خۆشگوزەرانیی دەستبکەوێت، بەڵام داهاتی وەبەرهێنان لەبۆچوونی ئیسلامدا لەوە گەورەترە ( بەڵێنی داوە بە خەرجکردنێك کە کاروباریان چاك بکات ، گوزەرانیان خۆشبکات ، ئینجا ئەگەر ئەو کارەت کرد ، نیعمەتت بۆ بڕیار دەدرێت و دەبیتە شیاوی خێری زیاتر لەلایەن خوای بەخشندەوە ، بەوشێوەیەش لەسەر وەرگرتنی باج و خەراجی هاووڵاتیان بەتواناتر دەبێت.. لەراستیدا سامان ئەوەی لێدەمێنێتەوە کە لە ڕێی خوادا خەرجکراوە و لەرێی راستی خۆیدا.. وریابە دنیاو خەڵەتاندنەکانی ،ناڕەحەتیەکانی قیامەتت لەبیر نەباتەوەو کەمتەرخەمیی بکەیت لەو مافانەی لەسەرتن، دەبا کارەکانت بۆ خوابن و چاوەڕێی پاداشت لەو بکە )[57]

هەروەها بناوانەکانی پەرەپێدان لە ئیسلامدا ، دووبارە لە چەمکی دەستکەوتی ماددیو کۆمەلآیەتیی تێدەپەڕێت بۆ ئاسۆی بەهاکان و رەوشت و رەفتارێك ، کە لە

---

[55] هەمان سەرچاوە ج٢،ص٦٧٩ لێرەدا دەردەکەوێتی کە ابن خەلدون لەپێش جۆن کینزەوە (١٨٨٣-١٩٥٦)ڕێی کەوتووە لە بیردۆزەی خەرجی گشتیی (حکومەت)سەیری ئەم کتێبە بکە: Michael Stewart ,Keynes and after Penguin Book ,2nd .Ed .1972,p.72

[56]

[57] هەمان سەرچاوە ،ل:٧٢٠

بەرهەمهێنان( وسائل الانتاج)و،دابەشکردنی کاری لە پێشخستنی کیفایەتی بەرهەمهێنان روون کردۆتەوە ، لێرەدا ئەوەمان مەبەست نییە کە پێشەوایەتیی لەو بوارەدا دەربخەین کە پێش ئادەم سمیس (١٧٢٣-١٧٩٠)کەوتووە بەچوار سەدە ، بەڵکو ئەوەی مەبەستمانە ئەوەیە کە پرۆسەی بەرهەمهێنان ، لەبیری زانایانی موسڵماندا ون نەبووە ، بەڵکو لە جێگای گونجاوی خۆیدا دایانناوە ، بەدانانی بەئامرازێکی ئاوەدانکردنەوەو مانەوەی جۆری مرۆڤ و پاراستنی ،بەوەش (بوونیان تەواو دەبێت و ئەو تەمەنەش کە خوای گەورە بۆی داناون و کردوونیە جێگر) [54]

ئینجا وەبەرهێنانی سامان و،بەگەڕخستنی وپاککردنەوەی (تزکیتها)، نەشو نماکردنی، بە خەرجکردنی لە بەرژەوەندی میللەتدا ، لەو خەرجکردنەش ئەوەی ئاراستە دەکرێت بۆ بەکاربردن-کە کارێکی زۆر گرنگە وەکو لە باسی خۆراکدا دیمان -،بەڵام چەمکی ناسراو لای زانایانی شەرع ، ئەوەی کە سامان( بەخەرجکردنی گەشە دەکات و بە هەڵگرتنی کەمدەکات)، گومان لەوەدا ناهێڵێتەوە کە خەرجکراوی ئاراستە بۆ (ئاوەدانکردنەوەی ئیسلام و خەڵکەکەی ) ئەوە لە راستیدا خەرجکردنێکی وەبەرهێنان و بەکاربردنیشە لە هەمان کاتدا، بەپێی خواستی بەرژەوەندی ئوممەت،( ئەوەش بزانە سامان ئەگەر پاشەکەوت کرا و لە خەزنەدا هەڵگیرا ، گەشە ناکات، بەڵام ئەگەر لەبەرژەوەندی هاوولاتیاندا بوو، مافی خۆی دانێو ئازاری لێهەڵگرتن، گەشەدەکات و پاکدەبێتەوە ,و خەڵکیشی بەگشتیی پێ چاك دەبێت و ویلایەتیشی پێ رێکدەخرێت و سەردەم خۆشدەبێت ، سوودو

---

[54] ابن خلدون ،المصدر نفسه ج١ ص٢٧٤

٢- هەر لەوانەش ، دابەشکردنی سامان به دادگەریی ، بەبێ لایەنگریی بۆ دەوڵەمەندان و پیاوماقولاٌن ، یان کەسانی تایبەتی دەوڵەت: (بڕوانە بۆ ئەو داهاتەی خەڵکی بە ڕێکوپێکی لەسەری ڕۆیشتوون و خوا کردوویەتی بە سەربەرزیی بۆ ئیسلام ..کەواتە دابەشی بکە لە نێوان خاوەنەکانیاندا بەهەق و دادگەریی و یەکسانیی، هیچی مەدە بە پیاوماقولێك لەبەر ماقووڵیی ، یا بە دەوڵەمەندێك لەبەر دەوڵەمەندیی ، یا نووسەرێکی لای خۆت ، یا هەر کەسێکی تایبەتی دەورووبەری خۆت.خەڵکی هەموو ناچاربکە لەسەر هەق بڕۆن. ) [59]

٣- هەروەها دانانی فراوانکردنی ڕۆزیی (بەرزکردنەوەی ئاستی بژێویی)بۆ خەڵکیی بە مافێك کە دراوەتە دەست تۆ ، دەبا هیچ شتێك لاتنەدات لێی[60].چونکە خەرجکردنی بۆ بەرژەوەندیی هاوولاٌتیان، بە واتای فراوانکردنی ڕۆزیی، خێر دەهێنێ‌و هاندەرە بۆ زیاتر گەشەسەندنی بەرەکەت و ، زیاترکردنی ئاوەدانیی : (تۆ هەرکاتێك ئەوەت هەڵبژاردوو ، ئەرکی سەرشانی خۆت ئەنجامدا ، بانگدەکرێیت بۆ زیاترکردنی بەخشش لە پەروەردگارەوەو بەچاك باسکردنی کارەکانت ، پشتگیریت دەکرێت لەسەر چاکەکاریی،خێراتی ولاٌتەکەت زیاد دەکەیت و، ئاوەدانی بلاٌودەکەیتەوە ، خێروبێر دەردەکەوێت و ، خەراج زۆردەبێت-داهات-سامانەکانت فراوان دەبێت(گەشە دەکات) [61]

٤- هەروەها پاکیی لە کۆکردنەوەی سامان و ڕێکخستنی و ، دوورکەوتنەوە لە دەستبلاٌوی لە خەرجیدا : (بزانە کاربەدەستانت چی کۆدەکەنەوە ) چی لێ خەرج دەکەن ، حەرام کۆمەکەرەوە ، زیادە مەسەرەفیش مەکە) [62]

---

[59] هەمن سەرچاوە

[60] هەمان سەرچاوە

[61] هەمان سەرچاوە ل٧٢٤

[62] هەمان سەرچاوە ل ٧٢٠

زیندوێتی ویژدان و دەروونپاکی هەڵقوڵاوە ، کە بە عیبادەت داڕژاوە و بە وەرع و لەخواترسان زیاد دەکات و ، بە گوێڕایەڵی بۆ فەرمانەکانی خوای گەورەو قەدەغەکراوەکانی لە قورئانی پیرۆزو سوننەتەکانی پێغەمبەردا

لەدووتوێی ئەو دەروونەی کە بە رەوشتی قورئان پەروەردەکراوە و پاك بۆتەوەو لە هەوڵدایە و چاوەچاویەتی بۆ گەیشتن بە پلەی ئیحسان ، بەهاکان و رژێم و یاساکان ، کە حوکمی کاروباری خەڵکی دەکەن ، دەبێتە باوو سەقامگیر دەبێت ، دادەبەزێتە سەر واقیعەکەیان، بۆ ئەوەی ئاسایش و دادگەریی و دڵنیاییان پێ ببەخشێت و ، بەو نیعمەتانەش رابوێرن کە خوا پێی بەخشیون و، دووریش بکەونەوە لە گومڕایی و ستەم و بەدرەفتاریی ..لەسەر بنچینەو بنەماگەلێك ئابووری ئاراستە بکات ، کە لە بارودۆخی خۆیدا پشت بە داهێنراوەکانی ئەقڵ و زانست و تاقیکردنەوەو بیروڕای فەقیهەکان ببەستێت. گەورەترین بنەما کە مێژووی ئابووری ئیسلام تۆماری کردووە لە بواری پەرەپێداندا ، ئەوەی کە لە نامەکەی (تاهیر بن حسەین) دا هاتووە ، لەو نامەیەدا ئاراستەگەلێکی دیاریی هاتوون ، ئەوە پێکدەهێنن کە دەتوانین ناوی بنێین نمونەیەکی ئیسلامیی لە ستراتیژیەتی پەرەپێدان:-

١- لەوانەش-لەپێش هەموویاندا-ئاگادارکردنی دەوڵەت لە بەرپرسیاریەتەکانی بە دانانی بە ئەمیندارو سەرپەرشتیارو بەرێوەبەری کاروباری ئوممەت: ( بزانە تۆ بە بوونت بە کاربەدەست و خەزنەدارو پارێزگارو چاودێری هاوولاتیان ، ئەوان بۆیە ناونراون (رەعیەت) چونکە تۆ چاودێرو سەرپەرشتیاریانی ، دە وەرگرە ئەوەی دەتدەنێلە زیادەی خۆیان (واتە ئەوەی لە خۆیان زیادە ، یا پاشەکەوتەکەیان) بەکاری بهێنە لە کاروباری خۆیاندا و ، چاکترکردنی گوزەرانیان و راستکردنەوەی لاریەکانیان )[58]

---

[58] هەمان سەرچاوە

٢- هەر لەوانەش ، دابەشکردنی سامان  بە دادگەریی ، بەبێ لایەنگریی بۆ دەوڵەمەندان و پیاوماقوڵان ، یان کەسانی تایبەتی دەوڵەت: (بڕوانە بۆ ئەو داهاتەی خەڵکی بە ڕێکوپێکی لەسەری ڕۆیشتوون و خوا کردوویەتی بە سەربەرزیی بۆ ئیسلام ..کەواتە دابەشی بکە لە نێوان خاوەنەکانیاندا  بەهەق و دادگەریی و یەکسانیی، هیچی مەدە بە پیاوماقوڵێك لەبەر ماقووڵیی ، یا بە دەوڵەمەندێك لەبەر دەوڵەمەندیی ، یا نووسەرێکی لای خۆت ، یا هەر کەسێکی تایبەتی دەورووبەری خۆت.خەڵکی هەموو ناچاربکە لەسەر هەق بڕۆن. ) [59]

٣- هەروەها دانانی فراوانکردنی ڕۆزیی (بەرزکردنەوەی ئاستی بژێویی)بۆ خەڵکیی بە مافێك کە دراوەتە دەست تۆ ، دەبا هیچ شتێك لاتنەدات لێی[60].چونکە خەرجکردنی بۆ بەرژەوەندیی هاووڵاتیان، بە واتای فراوانکردنی ڕۆزیی، خێر دەهێنێ‌و هاندەرە بۆ زیاتر گەشەسەندنی بەرەکەت و ، زیاترکردنی ئاوەدانیی : (تۆ هەرکاتێك ئەوەت هەڵبژاردوو ، ئەرکی سەرشانی خۆت ئەنجامدا ، بانگدەکرێیت بۆ زیاترکردنی بەخشش لە پەروەردگارەوەو بەچاك باسکردنی کارەکانت ، پشتگیریت دەکرێت لەسەر چاکەکاریی،خێراتی وڵاتەکەت زیاد دەکەیت و، ئاوەدانی بڵاودەکەیتەوە ، خێروبێر دەردەکەوێت و ، خەراج زۆردەبێت-داهات-سامانەکانت فراوان دەبێت(گەشە دەکات) [61]

٤- هەروەها پاکیی لە کۆکردنەوەی سامان و ڕێکخستنی و ، دوورکەوتنەوە لە دەستبڵاوی لە خەرجیدا : (بزانە کاربەدەستانت چی کۆدەکەنەوە ) چی لێ خەرج دەکەن ، حەرام کۆمەکەرەوە ، زیادە مەسەرەفیش مەکە) [62]

---

[59]هەمن سەرچاوە

[60]هەمان سەرچاوە

[61]هەمان سەرچاوە ل٧٢٤

[62]هەمان سەرچاوە ل ٧٢٠

زیندوێتی ویژدان و دەروونپاکی هەڵقوڵاوە ، کە بە عیبادەت داڕژاوە و بە وەرع و لەخواترسان زیاد دەکات و ، بە گوێڕایەڵی بۆ فەرمانەکانی خوای گەورەو قەدەغەکراوەکانی لە قورئانی پیرۆزو سوننەتەکانی پێغەمبەردا

لەدووتوێی ئەو دەروونەی کە بە رەوشتی قورئان پەروەردەکراوە و پاك بۆتەوەو لە هەوڵدایە و چاوەچاویەتی بۆ گەیشتن بە پلەی ئیحسان ، بەهاکان و رژێم و یاساکان ، کە حوکمی کاروباری خەڵکی دەکەن ، دەبێتە باوو سەقامگیر دەبێت ، دادەبەزێتە سەر واقیعەکەیان، بۆ ئەوەی ئاسایش و دادگەریی و دڵنیاییان پێ ببەخشێت و ، بەو نیعمەتانەش رابوێرن کە خوا پێی بەخشیون و، دووریش بکەونەوە لە گومڕایی و ستەم و بەدرەفتاریی ..لەسەر بنچینەو بنەماگەلێك ئابووری ئاراستە بکات ، کە لە بارودۆخی خۆیدا پشت بە داهێنراوەکانی ئەقڵ و زانست و تاقیکردنەوەو بیروڕای فەقیهەکان ببەستێت. گەورەترین بنەما کە مێژووی ئابووری ئیسلام تۆماری کردووە لە بواری پەرەپێداندا ، ئەوەی کە لە نامەکەی (تاهیر بن حسەین) دا هاتووە ، لەو نامەیەدا ئاراستەگەلێکی دیاریی هاتوون ، ئەوە پێکدەهێنن کە دەتوانین ناوی بنێین نمونەیەکی ئیسلامیی لە ستراتیژیەتی پەرەپێدان:-

١- لەوانەش-لەپێش هەموویاندا-ئاگادارکردنی دەوڵەت لە بەرپرسیاریەتەکانی بە دانانی بە ئەمیندارو سەرپەرشتیارو بەڕێوەبەری کاروباری ئوممەت: ( بزانە تۆ بە بوونت بە کاربەدەست و خەزنەدارو پارێزگارو چاودێری هاووڵاتیان ، ئەوان بۆیە ناونراون (رەعیەت) چونکە تۆ چاودێرو سەرپەرشتیاریانی ، دە وەرگرە ئەوەی دەتدەنێلە زیادەی خۆیان (واتە ئەوەی لە خۆیان زیادە ، یا پاشەکەوتەکەیان) بەکاری بهێنە لە کاروباری خۆیاندا و ، چاکترکردنی گوزەرانیان و راستکردنەوەی لاریەکانیان )[58]

---

[58] هەمان سەرچاوە

کارکردنی دەبێت. [67] هەروەها نەخۆشخانەش هەبووە بۆ نەخۆشیە دەروونیەکان کە پزیشکی پسپۆڕ کاری تێدا کردووە.)[68]

٨- هەروەها چاودێریی هەژاران و نەداران و کەمئەندامان و هەتیوان و بێوە١ژنان : (لە خەزێنەی سامان رۆزییان بۆ دیاری بکە ، بەچاولێکردنی ئەمیری ئیمانداران خوا سەربەرزی بکات، بەوەی سۆزی هەبوو بۆیان و پەیوەندی کردووە پێیانەوە ، ئەوانەشی پێشخستووە کە قورئانیان لەبەربووە و زۆرتریان لەبەربوو [69] هەرشتێك کە پێشخستنی گرنگ بێت .

٩- هەروەها گەران بەدوای ستەملێکراوان و هەژاران و نەداران ، ئەوانەی کە ناتوانن ستەملێکراویان بگەیەنن بە دادگاکان و ، بپرسەرەوە لەوانەش کە نازانن چۆن داوای مافی خۆیان بکەن : ( خۆت تایبەت بکە بە پشکنین لە کاروباری هەژاراندا و ئەوانەش کە ناتوانن مافخوراویان بگەیەننە تۆ ، ئەو بەسووك سەیرکراوەش کە نازانیٚ چۆن داوای مافی خۆی بکات، لێی بپرسە لەوانەیە کێشەیەکی شاردبێتەوە. [70]

١٠- هەستکردن بەکات و کاریگەریی لەسەر بەرهەم ، ئینجا گرنگیی بەفیڕۆنەدانی کات، چونکە بەشێکە لەژیانی ئادەمیزاد کە لێی دەپرسرێتەوە لە قیامەتدا: (ئیشی ئەمڕۆت تەواو بکە و مەیخەرە سبەینیٚ ، خۆت دەستبەکاربە تێیدا ، چونکە سبەینێش کاروبارو رووداوی خۆی هەیە کە کاری ئەمڕۆت لەبیر دەباتەوە کە دوات خستووە. ئەوەش بزانە کە ئەمڕۆ رۆیشت چی تیابووە هەمووی لەگەڵ خۆی دەبات [71]

---

[67] هەمان سەرچاوە ل:٢٤٩

[68] هەمان سەرچوە ل:٣٤٥

[69] ابن خلدون ،المقدمة ،رسالة طاهر بن الحسين ،مصدر سابق ،ج٢،ص٧٢٢-٧٢٣

[70] هەمان سەرچاوە ل:٧٢١-٧٢٢

[71] هەمان سەرچاوە ل:٧٢١

٥- ئینجا  جەخت کردنەوە لەسەر رۆڵی شارەزایی‌و زانست و تاقیکردنەوە لە چاك کارئەنجامدان : (خاوەن بیروراو تەگبیرو ئەزموون و شارەزا لە زانست و لە دادگەریی‌و سیاسەت و پاکیدا  بکە بە کاربەدەستیان)- [63]

٦- چاودێریی کارگێڕیی توندوتۆڵ بکە لە جێبەجێکردنی کارەکاندا، لە دووتوێی بەدواداچوون و راپۆرتی نووسراودا : (لە هەرناوچەیەك بڕواپێکراوێك دابنێ کە ئاگادارت بکات لە کاری کاربەدەستانت ، کارو هەڵسوکەوتیانت بۆ بنووسێت ، هەتا ئاگاداری کارەکانیان بیت وەکو ئەوەی لەگەڵیاندا بیت) [64]

٧- چاودێریی تەندروستی و کۆمەڵایەتی و دیاریکردنی شتە گرنگەکان لە سەرەتاوە : ( جێگایەك دروستبکە بۆ نەخۆشانی موسڵمانان کە پەنایان بدات ، کەسانێك دابنێ بۆ هاوڕێیەتیان ، هەروەها پزیشکیش بۆ چارەسەری دەردەکانیان [65] لە تۆمارە مێژوویەکاندا هاتووە لەسەردەمی عەباسیەکاندا  و دەوڵەتە هاوکاتەکانی کە لەدوای ئەو هاتنە عێراق و میسرو ئاسیاو ئەفریقاو ئەوروپا نەخۆشخانەیەکی زۆر دروستکرابوو کە پێشوازیان لە هەموو نەخۆشێك دەکرد، بەبێ گوێدانە رەنگ و ئایین و پلەوپایەی ،هەروەها نەخۆشخانەی گەڕۆکیشیان هەبووە ، کە بەگوندەکاندا گەڕاون ،بۆ چارەسەری نەخۆشەکان.[66] نیشانەی چاکبوونەوەش توانای خواردنی مریشکێکی تەواو بە نانەوە بووە ،لە دوای دەرچوونیشی لە نەخۆشخانە دەستێك بەرگ و بڕێك پارەیان داوەتێ کە بەشی بکات تا توانای

---

[63] هەمان سەرچاوە ل ٧٢١

[64] هەمان سەرچاوە ل:٧٢٢-٧٢٣

[65] ناجي معروف ،اصالة الحضارة العربية .دار الثقافة ،بيروت ١٩٧٥ص٢٤٤

[66] هەمان سەرچاوە ت:٢٤٥-٢٤٦

کارکردنی دەبێت. [67] هەروەها نەخۆشخانەش هەبووە بۆ نەخۆشیە دەروونیەکان کە پزیشکی پسپۆڕ کاری تێدا کردووە.)[68]

٨- هەروەها چاودێریی هەژاران و نەداران و کەمئەندامان و هەتیوان و بێوە\ژنان : (لە خەزێنەی سامان ڕۆزییان بۆ دیاری بکە ، بەچاولێکردنی ئەمیری ئیمانداران خوا سەربەرزی بکات، بەوەی سۆزی هەبوو بۆیان و پەیوەندی کردووە پێیانەوە ، ئەوانەشی پێشخستووە کە قورئانیان لەبەربووە و زۆرتریان لەبەربوو [69] هەرشتێك کە پێشخستنی گرنگ بێت .

٩- هەروەها گەران بەدوای ستەملێکراوان و هەژاران و نەداران ، ئەوانەی کە ناتوانن ستەملێکراویان بگەیەنن بە دادگاکان و ، بپرسەرەوە لەوانەش کە نازانن چۆن داوای مافی خۆیان بکەن : ( خۆت تایبەت بکە بە پشکنین لە کاروباری هەژاراندا و ئەوانەش کە ناتوانن مافخوراویان بگەیەننە تۆ ، ئەو بەسووك سەیرکراوەش کە نازانێ چۆن داوای مافی خۆی بکات، لێی بپرسە لەوانەیە کێشەیەکی شاردبێتەوە. [70]

١٠- هەستکردن بەکات و کاریگەریی لەسەر بەرهەم ، ئینجا گرنگیی بەفیڕۆنەدانی کات، چونکە بەشێکە لەژیانی ئادەمیزاد کە لێی دەپرسرێتەوە لە قیامەتدا: (ئیشی ئەمڕۆت تەواو بکە و مەیخەرە سبەینێ ، خۆت دەستبەکاربە تێیدا ، چونکە سبەینێش کاروبارو ڕووداوی خۆی هەیە کە کاری ئەمڕۆت لەبیر دەباتەوە کە دوات خستووە. ئەوەش بزانە کە ئەمڕۆ ڕۆیشت چی تیابووە هەمووی لەگەڵ خۆی دەبات [71]

---

[67] هەمان سەرچاوە ل:٢٤٩

[68] هەمان سەرچوە ل:٢٤٥

[69] ابن خلدون ،المقدمة ،رسالة طاهر بن الحسين ،مصدر سابق ،ج٢،ص٧٢٢-٧٢٣

[70] هەمان سەرچاوە ل:٧٢١-٧٢٢

[71] هەمان سەرچاوە ل:٧٢١

٥- ئینجا جەخت کردنەوە لەسەر رۆڵی شارەزایی‌و زانست و تاقیکردنەوە لە چاك کارئەنجامدان : (خاوەن بیروراو تەگبیرو ئەزموون و شارەزا لە زانست و لە دادگەریی‌و سیاسەت و پاکیدا بکە بە کاربەدەستیان)- [63]

٦- چاودێریی کارگێڕیی توندوتۆڵ بکە لە جێبەجێکردنی کارەکاندا، لە دووتوێی بەدواداچوون و راپۆرتی نووسراودا : (لە هەرناوچەیەك بڕواپێکراوێك دابنێ کە ئاگادارت بکات لە کاری کاربەدەستانت ، کارو هەڵسوکەوتیانت بۆ بنووسێت ، هەتا ئاگاداری کارەکانیان بیت وەکو ئەوەی لەگەڵیاندا بیت) [64]

٧- چاودێریی تەندروستی و کۆمەلأیەتی و دیاریکردنی شتە گرنگەکان لە سەرەتاوە : ( جێگایەك دروستبکە بۆ نەخۆشانی موسڵمانان کە پەنایان بدات ، کەسانێك دابنێ بۆ هاورێیەتیان ، هەروەها پزیشکیش بۆ چارەسەری دەردەکانیان [65] لە تۆمارە مێژوویەکاندا هاتووە لەسەردەمی عەباسیەکاندا و دەوڵەتە هاوکاتەکانی کە لەدوای ئەو هاتنە عێراق و میسرو ئاسیاو ئەفریقاو ئەوروپا نەخۆشخانەیەکی زۆر دروستکرابوو کە پێشوازیان لە هەموو نەخۆشێك دەکرد، بەبێ گوێدانە رەنگ و ئایین و پلەوپایەی ،هەروەها نەخۆشخانەی گەرۆکیشیان هەبووە ، کە بەگوندەکاندا گەڕاون ،بۆ چارەسەری نەخۆشەکان.[66] نیشانەی چاکبوونەوەش توانای خواردنی مریشکێکی تەواو بە نانەوە بووە ،لە دوای دەرچوونیشی لە نەخۆشخانە دەستێك بەرگ و بڕێك پارەیان داوەتێ کە بەشی بکات تا توانای

---

[63] هەمان سەرچاوە ل ٧٢١

[64] هەمان سەرچاوە ل:٧٢٢-٧٢٣

[65] ناجی معروف ،اصالة الحضارة العربیة .دار الثقافة ،بیروت ١٩٧٥ص٢٤٤

[66] هەمان سەرچاوە ت:٢٤٥-٢٤٦

**پێکەوە کۆکردۆتەوە ، ئیبن خەلدونیش کردوویەتی بە نمونەیەك ، بۆ بەهێزکردنی قسەکانی لە: ( ئاوەدانکاریی مرۆیی پێویستی بە سیاسەتێك هەیە کە کارەکانی بۆ ڕێکبخات )** [75]

**ئەگەر ئەو بەڵگەنامەیە خاڵیی بێت لە ئاماژەیەکی ئاشکرا بۆ وەبەرهێنانی مرۆیی ، تەفسیرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دەوڵەتی ئیسلامیی –بە سروشتی خۆی– دەوڵەتی زانست بووە ، بانگەوازی ئیسلامیی –لەگەڵ سەرهەڵدانیدا– هاوڕێ بووە لەگەڵ هاندان بۆ زانست و ڕێڕەوە زانستیەکەشی لە بواری جێبەجێکردندا ، سستمی پەروەردەیی ئیسلامیی و، بەرز ڕاگرتنی پلەی زانایان و ، دامەزراندنی پەیمانگاو قەتابخانەو زانکۆو (دار الحکم) ی لێ‌پەیدابووە . راپەڕینیش لە سەردەمی مەئموندا گەیشتە چڵەپۆپە ، لەکاتێکا بەغدا گرنگترین جێگابوو بۆ جولاْنەوەی زانستیی لە دنیاداو** [76] **بە پایتەختی فکریی ناودەبرا.**

**ئەو سەردەمە زانستەکانی قورئان و فەرموودەو فیقهو شەرع و زانستی پزیشکیی‌و ئەندازەیی‌و ئەستێرەناسیی‌و بیرکاریی‌و کۆمەلاْیەتیەکان زۆر پێشکەوتبوون . خوێندنی پزیشکیی‌و بیرکاریی‌و کیمیاو ئەستێرەناسیی پشکی گەورەی بایەخ پێدانیان بەرکەوتبوو ، چونکە پێویستیی زۆریان پێیان هەبوو . ( فیزیاویەکان و کیمیاویەکان و پزیشکەکان لە پێشبڕکێدابوون لە دۆزینەوەی نهێنیەکانی بوونەوەرو یاساکانی، و تایبەتمەندەکانی کانزاکان و ترشەڵۆکەکان و خوێ فیزیاویی‌و کیمیاویەکان تۆمارکران)** [77]

**ناوی خەواریزمەیی‌و بەیرونیی‌و رازی دەدرەوشایەوە ، لە دوای ئەوانیش ئیبن سیناو قەزوینیی‌و ئیبن نەفیس و ..جولاْنەوەی فکریی زۆر فراوان بوو لە حەڵەب و**

(75) هەمان سەرچاوە ل:٧١١

(76) ناجی معروف ،اصالة الحضارة العربیة ،مصدر سابق ص٤٢١

(77) ماکس فانتاجو ، المعجزه العربیه ، نقله الی العربیه رمچان لاوند ،دار للملایین ،بیروت ١٩٥٩ص٧٩

١١- بایەخدان و ڕێزگرتن لە فیقهو هەڵگرانیو ئایین و قورئان و ئەوانەی کاری پێدەکەن : (چاکترین شت کە مرۆڤ خۆی پێ بڕازێنێتەوە ، شارەزایی لە ئاییندا و هەوڵدان بۆی و هاندانی خەڵکی لەسەری )[72]

١٢- کۆتاییو پاڵپشتی هەموویان : ( پشت بەستن بەخوای گەورە لە هەموو بارودۆخێکدا ، خۆشویستنی هەمیشەییو کارکردن بە شەریعەتەکەی و سوننەتەکانی و پیادەکردنی ئایین و کتێبەکەی ) [73]

(وەرگیراو لە پەیامەکەی تاهیر بن حسەین تەواو بوو)

ئەم بەڵگەنامە گرنگە -وەکو وترا- ئاراستەی یەکێك لە حاکمەکانی دەوڵەتی عەباسی کراوە . بەڵام خەلیفە مەئمون کوڕی هارونە رەشید ، دوای ئەوەی چاوی پێی کەوتووە ، کردوویەتی بە سیاسەتی گشتیی دەوڵەتەکەی ، بەوەش وەسفی نووسەرەکەی کردووە کە : ( هیچ شتێکی نەهێڵاوەتەوە لە کاروباری دنیاو دین و، تەگبیرو ڕاو، سیاسەت و، چاکیی پاشاو هاووڵاتیان و، پاراستنی دەسەڵات) [74] ئینجا فەرمانی کردووە کە رایبگەیەنن بە هەموو والیەکاندا بۆ کارپێکردنیو جێبەجێکردنی• ، ئەوەی پێویستی بەروونکردنەوە نیە ، لە راستیدا گرنگیی ئەو بەڵگەنامەیە لەوەدایە ، کە بنەماو سیاسەتێکی تێدایە لە پەیوەستبوونی بە وەحیو، ڕێنماییەکانی قورئان و سوننەو ، بەرنامەی پەرەپێدانی زانستیی ، لە جێبەجێکردنی ئەو بنەمایانەدا لەسەر واقیعی کۆمەڵگا لەوکاتەدا.. ئەمانەهەمووی

---

[72] هەمان سورچاوە ل:٧١٤

[73] هەمان سەرچاوە ٧٢٤

[74] هەمان سەرچاوە ل:٧٢٥

• ناوی عەبدولڵای کوڕی تەهای کوڕی حسەینە (١٨٢-٢٣٠ك)حاکمی شام و میسر بوو خەلیفە مەئمون زۆر متمانەی پێی هەبوو .سەیری (وفیات الاعیان ی ئیبن خەلەکان بکە بەرگی سێیەم ل:٧٨لێکۆڵینەوەی ئیحسان عەباس دار الثقافە بیروت١٩٦٩

ئەم بەڵگەنامەیە ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەوەی کە دەڵێن گوایا بە کۆتایی هاتنی حوکمی خەلیفەکانی راشدین دەوڵەتی ئیسلامی کە بە قورئان و سوننە حوکمی کردبێ کۆتایی هاتووە راست نیە.ئەوانەی وادوڵێن قووڵ نەبوونەتەوە لە میژووی ئیسلامدا .

پێکەوە کۆکردۆتەوە ، ئیبن خەلدونیش کردوویەتی بە نمونەیەك ، بۆ بەهێزکردنی قسەکانی لە: ( ئاوەدانکاریی مرۆیی پێویستی بە سیاسەتێك هەیە کە کارەکانی بۆ رێکبخات ) [75]

ئەگەر ئەو بەڵگەنامەیە خاڵیی بێت لە ئاماژەیەکی ئاشکرا بۆ وەبەرهێنانی مرۆیی ، تەفسیرەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دەوڵەتی ئیسلامیی –بە سروشتی خۆی– دەوڵەتی زانست بووە ، بانگەوازی ئیسلامیی –لەگەڵ سەرهەڵدانیدا– هاوڕێ بووە لەگەڵ هاندان بۆ زانست و ڕێڕەوە زانستیەکەشی لە بواری جێبەجێکردندا ، سستمی پەروەردەیی ئیسلامیی و، بەرز راگرتنی پلەی زانایان و ، دامەزراندنی پەیمانگاو قەتابخانەو زانکۆو (دار الحكم) ی لێ‌پەیدابووە . راپەڕینیش لە سەردەمی مەئمونیدا گەیشتە چڵەپۆپە ، لەکاتێکا بەغدا گرنگترین جێگابوو بۆ جوڵانەوەی زانستیی لە دنیاداو [76] بە پایتەختی فکریی ناودەبرا.

ئەو سەردەمە زانستەکانی قورئان و فەرموودەو فیقهو شەرع و زانستی پزیشکییو ئەندازەییو ئەستێرەناسییو بیرکارییو کۆمەڵایەتیەکان زۆر پێشکەوتبوون . خوێندنی پزیشکییو بیرکارییو کیمیاو ئەستێرەناسیی پشکی گەورەی بایەخ پێدانیان بەرکەوتبوو ، چونکە پێویستیی زۆریان پێیان هەبوو . ( فیزیاویەکان و کیمیاویەکان و پزیشکەکان لە پێشبڕکێدابوون لە دۆزینەوەی نهێنیەکانی بوونەوەرو یاساکانی، و تایبەتمەندەکانی کانزاکان و ترشەڵۆکەکان و خوێ فیزیاوییو کیمیاویەکان تۆمارکران) [77]

ناوی خەواریزمییو بەیرونییو رازی دەدرەوشایەوە ، لە دوای ئەوانیش ئیبن سیناو قەزوینییو ئیبن نەفیس و ..جوڵانەوەی فکریی زۆر فراوان بوو لە حەڵەب و

[75] هەمان سەرچاوە ل:٧١١

[76] ناجی معروف ،اصالة الحضارة العربية ،مصدر سابق ص٤٢١

[77] ماكس فانتاجو ، المعجزه العربيه ، نقله الى العربيه رمچان لاوند ،دار للملايين ،بيروت ١٩٥٩ص٧٩

**١١- بایەخدان و ڕێزگرتن لە فیقهو هەڵگرانیو ئایین و قورئان و ئەوانەی کاری پێدەکەن : (چاکترین شت کە مرۆڤ خۆی پێ برازێنێتەوە ، شارەزایی لە ئایینداو هەوڵدان بۆی و هاندانی خەڵکی لەسەری )[72]**

**١٢- کۆتایيو پاڵپشتی هەموویان : ( پشت بەستن بەخوای گەورە لە هەموو بارودۆخێکدا ، خۆشویستنی هەمیشەییو کارکردن بە شەریعەتەکەی و سوننەتەکانی و پیادەکردنی ئایین و کتێبەکەی ) [73]**

**(وەرگیراو لە پەیامەکەی تاهیر بن حسەین تەواو بوو)**

**ئەم بەڵگەنامە گرنگە -وەکو وترا- ئاراستەی یەکێك لە حاکمەکانی دەوڵەتی عەباسی کراوە . بەڵام خەلیفە مەئمون کوڕی هارونە ڕەشید ، دوای ئەوەی چاوی پێی کەوتووە ، کردوویەتی بە سیاسەتی گشتیی دەوڵەتەکەی ، بەوەش وەسفی نووسەرەکەی کردووە کە : ( هیچ شتێکی نەهێڵاوەتەوە لە کاروباری دنیاو دین و، تەگبیرو ڕاو، سیاسەت و، چاکیی پاشاو هاووڵاتیان و، پاراستنی دەسەڵات) [74] ئینجا فەرمانی کردووە کە رایبگەیەنن بە هەموو والیەکاندا بۆ کارپێکردنیو جێبەجێکردنی• ، ئەوەی پێویستی بەروونکردنەوە نیە ، لە راستیدا گرنگیی ئەو بەڵگەنامەیە لەوەدایە ، کە بنەماو سیاسەتێکی تێدایە لە پەیوەستبوونی بە وەحیو، ڕێنماییەکانی قورئان و سوننەو ، بەرنامەی پەرەپێدانی زانستیی ، لە جێبەجێکردنی ئەو بنەمایانەدا لەسەر واقیعی کۆمەڵگا لەوکاتەدا.. ئەمانەهەمووی**

---

[72] هەمان سورچاوە ل:٧١٤

[73] هەمان سەرچاوە ٧٢٤

[74] هەمان سەرچاوە ل:٧٢٥

• ناوی عەبدوڵای کوڕی تەهای کوڕی حسەینە (١٨٢-٢٣٠ك)حاکمی شام و میسر بوو خەلیفە مەئمون زۆر متمانەی پێی هەبوو .سەیری (وفیات الاعیان ی ئیبن خەلەکان بکە بەرگی سێیەم ل:٧٨لێکۆڵینەوەی ئیحسان عەباس دار الپقافە بیروت١٩٦٩

ئەم بەڵگەنامەیە ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەوەی کە دەڵێن گوایا بە کۆتایی هاتنی حوکمی خەلیفەکانی راشدین دەوڵەتی ئیسلامی کە بە قورئان و سوننە حوکمی کردبێ کۆتایی هاتووە راست نیە.ئەوانەی وادوڵێن قووڵ نەبوونەتەوە لە میژووی ئیسلامدا .

، لێکۆڵینەوە لە تایبەتمەندەکانی (کۆمەڵگای تەقلیدی) لە دەرهاویشتەکانی زانست کە پێش سەردەمی نیوتن بوو) [(80)]

کاروانی ئاوەدانکاریی (العمران)،لە مێژووی ئیسلامدا نمونەیەکی زیندووە ، لەسەر توانای وەرگرتنی بیرەکان و ، داهێنانی رژێم و، هەڵگۆزینی سیاسەتەکان و،چارەسەرەکان لە سەرچاوە ئیسلامیەکانەوە ، پیادەکردنی لە هەر سەردەمێکدا بەشێوەیەك کە بگونجێت لەگەڵ بارودۆخی ژیانی بەرەو نوێبوونەوە رۆیشتوو، کە لە ئیسلامدا جێگای دەبێتەوە و، رێگای لێتەنگ ناکاتەوە و، زاڵە بەسەریداو ناشتوێتەوە لە ناویا .ئەوەیە موسڵمانەکان لە مێژووی دووروودرێژیاندا کردوویانە ، لە هەموو سەردەمێکدا دیاردەی نوێیان گرتۆتە خۆیان و ، لەگەڵ ژیارەکانی تردا کارلێکیان کردووە لە مەنتقی بیروباوەڕیانەوە ، لە بناوانی رەسەن و بەتوانا لە هەڵبژاردندا نەك لە جێگای پاشکۆییو لاوازیەوە .

ئەوە ئەو ئاماژەیە کە بەلامانەوە گرنگە بەرامبەر بە واقیعی ئیسلامیی ، کە تائێستاش رێبازە دانراوەکان بە چەپ و راستیەوە لە کێشمەکێشمدان ، ئەویش پاڵپشتێکی مەزنی لە بیرو شارەزایی و ئەزموون هەیە، لە بواری ئاوەدانکاریدا هیچی کەم نیە جگە لە رابوونێکی بیریی نوێکەرەوە نەبێت، لەگەڵ بەخشینی زیاترو ئیجتهادو هەڵگۆزینی چارە بۆ کێشەکانی سەردەم ، لەپێش هەموویانەوە کێشەی پەرەپێدان.

---

[(80)] Rostow ,Op.Cit.p.4

قاهیرەو بوخاراو قورتوبە ، هاندەری خوێندنی پزیشکیی‌و زانستەکان –وەکو عەقاد دەڵێ–پێویستیی ئاوەدانکردنەوەیەکی تەواو بوو ، نەك پێویستیی تاکەکان و تایەفەکان..هەروەها گەورە پزیشکان زانستێکی تریشیان زیادکرد بۆ زانستی پزیشکیی ، ئەویش فەلسەفەو ئەندازەو هەیئەو قیافەو ئەستێرەناسیی‌و کیمیا بوو، ئەوانە مەوسوعەی زۆریان تۆمار کردووە .هەتا وایلێهات پزیشکانی ئەوروپا عەرەبییان دەخوێند بۆ ئەوەی سوودی لێوەربگرن لە کارکردنیاندا لە پزیشکیی‌و سامان بەدەستهێناندا.(78)

لەوانەیە کەسێك بڵێت :دەستکەوتەکانی رابووردوو ، سوودی نیە بۆ روبەڕوبوونەوە لەگەڵ کێشە ئابووریەکانی ئەم سەردەمەدا ، چونکە جیاوازیەکی زۆر هەیە لەنێوان کێشەکانی کۆمەڵگای کشتوکاڵیی لەسەدەکانی ناوەڕاستداو ، کێشەکانی کۆمەڵگای پیشەسازیی نوێ، ئەوەش قسەیەکی راستە، بەڵام هەمووی راست نیە ، چونکە خوێندنەوەی ژیرانەی رابوردوو رێگایە بۆ زانینی ئەو کاریگەریانەی کە ئێستایان دارشتووە ..بینینی داهاتوو روون نابێت بە تێگەیشتنی ئەو کاریگەریانە نەبێت..ئەوەبوو مارکسیش وایکردووە ،کاتێ پشتی بەستبوو بە مێژووی رۆمانی کۆن و مێژووی ئەوروپای ناوەڕاست و ، مێژووی شۆڕشی پیشەسازیی ئەوروپا لە دارشتنی بیردۆزەی (ناکۆکیی چینایەتیدا)،گەیشتە ئەو قسەیەی : مێژووی کۆمەڵگا هەتا ئەو سەردەمە –سەردەمی مارکس–مێژووی ناکۆکیی چینایەتیە،(79) هەروەها رۆستۆش لە ئامادەکردنی بیردۆزەکەیدا ( قۆناغەکانی گەشەی ئابووری )پشتی بەستووە بە مێژووی سەرمایەداریی خۆرئاواو

(78) عبتس محمود العقاد اثر العرب فی الحضارة الاوربیة ،دار المعارف بمصر ،١٩٦٥ص٢٧-٢٩

(79) Marx Enhgels ,Selected Works ,Op.Cit.p.34,,The history of all hitherto existing society is the history of class struggie /

، لێکۆڵینەوە لە تایبەتمەندەکانی (کۆمەڵگای تەقلیدی) لە دەرهاویشتەکانی زانست کە پێش سەردەمی نیوتن بوو) [80]

کاروانی ئاوەدانکاریی (العمران)،لە مێژووی ئیسلامدا نمونەیەکی زیندووە ، لەسەر توانای وەرگرتنی بیرەکان و ، داهێنانی رژێم و، هەڵگۆزینی سیاسەتەکان و،چارەسەرەکان لە سەرچاوە ئیسلامیەکانەوە ، پیادەکردنی لە هەر سەردەمێکدا بەشێوەیەك کە بگونجێت لەگەڵ بارودۆخی ژیانی بەرەو نوێبوونەوە رۆیشتوو، کە لە ئیسلامدا جێگای دەبێتەوە و، رێگای لێتەنگ ناکاتەوە و، زاڵە بەسەریداو ناشتوێتەوە لە ناویا .ئەوەیە موسڵمانەکان لە مێژووی دووروودرێژیاندا کردوویانە ، لە هەموو سەردەمێکدا دیاردەی نوێیان گرتۆتە خۆیان و ، لەگەڵ ژیارەکانی تردا کارلێکیان کردووە لە مەنتقی بیروباوەڕیانەوە ، لە بناوانی رەسەن و بەتوانا لە هەڵبژاردندا نەك لە جێگای پاشکۆیی‌و لاوازیەوە .

ئەوە ئەو ئاماژەیە کە بەلامانەوە گرنگە بەرامبەر بە واقیعی ئیسلامیی ، کە تائێستاش رێبازە دانراوەکان بە چەپ و راستیەوە لە کێشمەکێشمدان ، ئەویش پاڵپشتێکی مەزنی لە بیرو شارەزایی و ئەزموون هەیە، لە بواری ئاوەدانکاریدا هیچی کەم نیە جگە لە رابوونێکی بیریی نوێکەرەوە نەبێت، لەگەڵ بەخشینی زیاترو ئیجتهادو هەڵگۆزینی چارە بۆ کێشەکانی سەردەم ، لەپێش هەموویانەوە کێشەی پەرەپێدان.

---

[80]Rostow ,Op.Cit.p.4

قاهیرەو بوخاراو قورتوبە ، هاندەری خوێندنی پزیشکییو زانستەکان –وەکو عەقاد دەڵێ–پێویستیی ئاوەدانکردنەوەیەکی تەواو بوو ، نەك پێویستیی تاکەکان و تایەفەکان..هەروەها گەورە پزیشکان زانستێکی تریشیان زیادکرد بۆ زانستی پزیشکیی ، ئەویش فەلسەفەو ئەندازەو هەیئەو قیافەو ئەستێرەناسییو کیمیا بوو، ئەوانە مەوسوعەی زۆریان تۆمار کردووە .هەتا وایلێهات پزیشکانی ئەوروپا عەرەبییان دەخوێند بۆ ئەوەی سوودی لێوەربگرن لە کارکردنیاندا لە پزیشکییو سامان بەدەستهێناندا. [78]

لەوانەیە کەسێك بڵێت :دەستکەوتەکانی رابووردوو ، سوودی نیە بۆ روبەڕوبوونەوە لەگەڵ کێشە ئابووریەکانی ئەم سەردەمەدا ، چونکە جیاوازیەکی زۆر هەیە لەنێوان کێشەکانی کۆمەڵگای کشتوکاڵیی لەسەدەکانی ناوەڕاستداو ، کێشەکانی کۆمەڵگای پیشەسازیی نوێ، ئەوەش قسەیەکی راستە، بەڵام هەمووی راست نیە ، چونکە خوێندنەوەی ژیرانەی رابوردوو رێگایە بۆ زانینی ئەو کاریگەریانەی کە ئێستایان داڕشتووە ..بینینی داهاتوو روون نابێت بە تێگەیشتنی ئەو کاریگەریانە نەبێت..ئەوەبوو مارکسیش وایکردووە ،کاتێ پشتی بەستبوو بە مێژووی رۆمانی کۆن و مێژووی ئەوروپای ناوەڕاست و ، مێژووی شۆڕشی پیشەسازیی ئەوروپا لە داڕشتنی بیردۆزەی (ناکۆکیی چینایەتیدا)،گەیشتە ئەو قسەیەی : مێژووی کۆمەڵگا هەتا ئەو سەردەمە –سەردەمی مارکس–مێژووی ناکۆکیی چینایەتیە،[79] هەروەها رۆستۆش لە ئامادەکردنی بیردۆزەکەیدا ( قۆناغەکانی گەشەی ئابووری )پشتی بەستووە بە مێژووی سەرمایەداریی خۆرئاوا

---

[78] عبتس محمود العقاد اثر العرب فى الحضارة الاوربية ،دار المعارف بمصر ،١٩٦٥ص٣٧-٣٩

[79] Marx Enhgels ,Selected Works ,Op.Cit.p.34,,The history of all hitherto existing society is the history of class struggie /

لەگەڵ ئەوەی بانقە ئیسلامیەکان –لەسەرەتای کاتیاندا–پشتیان تەنها بەکاری تەمویلی بازرگانیی کورتخایەن بەستبوو –بەحوکمی تازە ئەزموونیو سروشتی ئەو بەربەرەکانیانەی روبەڕویان دەبوویەوە –بەڵام ئەو سەردەمەیان تێپەڕاندو چوونە قۆناغی کرانەوەوە ، دوای ئەوەی توانای راکێشانی پشك و سپاردە وەرگرتنیان سەلماندو ، قازانجی باشیان بۆ پشکداران و سپاردەدانەران و وەبەرهێنەکان بەدەستهێنا ، ئەو سەرکەوتنە هانیدان بۆ چوونە بواری کارگوزاریە وەبەرهێنە زۆر مەترسیدارەکانیش، وەکو کشتوکاڵ و مامەڵە لەگەڵ پیشەوەرە بچوکەکان و ، پرۆژەکانی نیشتەجێکردن و پرۆژە پیشەسازیە گەورەکانیش. [82]

ئینجا تایبەتمەندو (مقومات) ی وا بۆ بانقە ئیسلامیەکان پەیدا بوو ، کە کردنی بە ئامێرێکی گرنگ بۆ بەدەستهێنانی پەرەپێدانی ئابووری کۆمەڵایەتی ، ئەویش لە چەند روویەکەوە ، لەوانەش:

١) شێوازی ئیسلامیی بۆ خەرجی پێدان(التمویل): قازانجی بەرزتری بەدەستهێنا بۆ خاوەن سپاردەکان لە کۆمەڵگادا ، ئەوەش مانای ئەوەیە بانقە ئیسلامیەکان توانای کۆکردنەوەی پاشەکەوتەکانیان هەیە ، دەتوانن کەڵەکەبوونی سەرمایەی روولەزیاد بۆ پەرەپێدان بەدەست بێنن..هۆی ئەو سەرکەوتنەش دەگەڕێتەوە بۆ خێراییو بەتوانایی دەستاودەست کردنی دەرامەتەکان Recycling، بەشداربوونی خاوەن سپاردەکان لە هەر قازانجێکی بەدەستهاتوو، ئەمەش لەشێوازی بانقە سووخۆرەکاندا ناکرێت، کە بەناکۆکیەکی پڕمەترسیەوە دەتلێنەوە ..خۆ ئەگەر بانق بیەوێت خاوەن سپاردەکان هانبدات بۆ بەرزکردنەوەی رێژەی سوو ، ئەوا وەبەرهێنەکان وەبەرهێنانیان کەمدەکەنەوە ، ئەوکاتە بێبازاڕییو بلاوبوونەوەی بێکاریی پەیدادەبێت ، خو ئەگەر نرخی سوو دابەزێنن بۆ هاندانی وەبەرهێنان ، ئەوکاتە

---

[82] هەمان سەرچاوە ل٨٩..

## بانقە ئیسلامیەکان و پەرەپێدان

لەوانەیە نزیکترین نموونە بۆ فراوانیی ئیسلام و بەخشینی نویی بەردەوامیی ئەزموونی بانقە ئیسلامیەکان بێت لەم سەردەمە نوێیەدا،لە راستیدا پێش نیو سەدە تەنها، هیوا یا بیرۆکەیەکی خەیاڵیی بوو ، زۆر لە بیریارە واقیع بینەکان لەو کاتەدا بە شتێکی خەیاڵیی یا مەلەکردن دژی تەوژمی روباریان دادەنا ، هەندێك دەیانپرسی : چۆن ژیانی ئابووریو مامەڵە بازرگانیەکان بەباشیی دەڕوات بەڕێوە لەسایەی ڕژێمێکدا کە سوو(فائدە–Interest)حەرام بکات؟بەڵام لەماوەی کەمتر لە دوو دەیەدا ،بانقە ئیسلامیەکان بریتی–بدیل–ی رژێمی بانقی سووداریان خستەبەردەست ، بەسەرکەوتوویی جێی خۆی کردەوە ، بۆ سەقامگیرکردنی شێوازێکی شەرعیی مامەڵە بانقیەکان ، لە چوارچێوەی بوژاندنەوەیەکی فیکریی پێگەیشتوو و ئیجتهادێکی پابەند بە بنەماکانی شەرعەوەو ، بەستراوەیش بە واقیعی کۆمەڵگای نویێ و گیروگرفتەکانیەوە .بەرهەمی ئەو کۆششانەش بڵاوبوونەوەی بیرۆکەی مامەڵە ئیسلامیەکان –هەتا لەناو ئیسلامیەکانیشدا –کە هەتا سەردەمێکی نزیك زاراوەی وەکو: ( مشارکە ، مرابحە ، کفالە ، حوالە ) نەزانرابوون،لای کەمایەتیەکی پسپۆڕ نەبێت، کەس نەیدەناسین. ئینجا دەستی کرد بە راکێشانی سەرنج بەلای خۆیدا ، لە دووتوێی کارپێکردنی یا بەراوردکردنی –ئەوەی کە بیریی ئیسلامیی بناوانی رەسەنی خۆی هەیە ، بۆ چارەسەری هەندێ لە گیروگرفتە ئابووریەکانی ئەم سەردەمە،وەکو گیروگرفتی هەڵئاوسانی ئابووری و، دۆزینەوەی ستراتیژیەتێکی جیاواز بۆ پەرەپێدان) [81]

---

[81] عبد الرحیم محمود حمدی ،تجربة البوك الاسلامیة ،الاسلام فی السودان ،بحوث مختارة من المؤتمر الاول لجماعة الفكر والثقافة الاسلامیة ،الخر طوم ٢٧-٣٠نوفمبر ١٩٨٢،دار الاصالة للصحافة والنشر ةالانتاج الاعلامی الخر طوم ١٩٨٧ص١٢٢

لەگەڵ ئەوەی بانقە ئیسلامیەکان –لەسەرەتای کاتیاندا–پشتیان تەنها بەکاری تەمویلی بازرگانیی کورتخایەن بەستبوو –بەحوکمی تازە ئەزموونیو سروشتی ئەو بەربەرەکانیانەی روبەڕویان دەبوویەوە –بەڵام ئەو سەردەمەیان تێپەڕاندو چوونە قۆناغی کرانەوەوە ، دوای ئەوەی توانای راکێشانی پشك و سپاردە وەرگرتنیان سەلماندو ، قازانجی باشیان بۆ پشکداران و سپاردەدانەران و وەبەرهێنەکان بەدەستهێنا ، ئەو سەرکەوتنە هانیدان بۆ چوونە بواری کارگوزاریە وەبەرهێنە زۆر مەترسیدارەکانیش، وەکو کشتوکاڵ و مامەڵە لەگەڵ پیشەوەرە بچوکەکان و ، پڕۆژەکانی نیشتەجێکردن و پڕۆژە پیشەسازیە گەورەکانیش. [82]

ئینجا تایبەتمەندو (مقومات) ی وا بۆ بانقە ئیسلامیەکان پەیدا بوو ، کە کردنی بە ئامێرێکی گرنگ بۆ بەدەستهێنانی پەرەپێدانی ئابووری کۆمەڵایەتی ، ئەویش لە چەند روویەکەوە ، لەوانەش:

١) شێوازی ئیسلامیی بۆ خەرجی پێدان(التمویل): قازانجی بەرزتری بەدەستهێنا بۆ خاوەن سپاردەکان لە کۆمەڵگادا ، ئەوەش مانای ئەوەیە بانقە ئیسلامیەکان توانای کۆکردنەوەی پاشەکەوتەکانیان هەیە ، دەتوانن کەڵەکەبوونی سەرمایەی رووڵەزیاد بۆ پەرەپێدان بەدەست بێنن..هۆی ئەو سەرکەوتنەش دەگەڕێتەوە بۆ خێراییو بەتوانایی دەستاودەست کردنی دەرامەتەکان Recycling، بەشداربوونی خاوەن سپاردەکان لە هەر قازانجێکی بەدەستهاتوو، ئەمەش لەشێوازی بانقە سووخۆرەکاندا ناکرێت، کە بەناکۆکیەکی پڕمەترسیەوە دەتلێنەوە ..خۆ ئەگەر بانق بیەوێت خاوەن سپاردەکان هانبدات بۆ بەرزکردنەوەی رێژەی سوو ، ئەوا وەبەرهێنەکان وەبەرهێنانیان کەمدەکەنەوە ، ئەوکاتە بێبازاڕییو بلاوبوونەوەی بێکاریی پەیدادەبێت ، خو ئەگەر نرخی سوو دابەزێنن بۆ هاندانی وەبەرهێنان ، ئەوکاتە

---

[82] هەمان سەرچاوە ل٩٨٠٠

# بانقه ئیسلامیەکان و پەرەپێدان

لەوانەیە نزیکترین نموونە بۆ فراوانیی ئیسلام و بەخشینی نویی بەردەوامیی ئەزموونی بانقە ئیسلامیەکان بێت لەم سەردەمە نوێیەدا،لە راستیدا پێش نیو سەدە تەنها، هیوا یا بیرۆکەیەکی خەیاڵیی بوو ، زۆر لە بیریارە واقیع بینەکان لەو کاتەدا بە شتێکی خەیاڵیی یا مەلەکردن دژی تەوژمی روباریان دادەنا ، هەندێك دەیانپرسی : چۆن ژیانی ئابووری‌و مامەڵە بازرگانیەکان بەباشیی دەڕوات بەڕێوە لەسایەی ڕژێمێکدا کە سوو(فائدە–Interest)حەرام بکات؟بەڵام لەماوەی کەمتر لە دوو دەیەدا ،بانقە ئیسلامیەکان بریتی–بدیل–ی رژێمی بانقی سووداریان خستەبەردەست ، بەسەرکەوتوویی جێی خۆی کردەوە ، بۆ سەقامگیرکردنی شێوازێکی شەرعیی مامەڵە بانقیەکان ، لە چوارچێوەی بوژاندنەوەیەکی فیکریی پێگەیشتوو و ئیجتهادێکی پابەند بە بنەماکانی شەرعەوەو ، بەستراوەیش بە واقیعی کۆمەڵگای نویّ و گیروگرفتەکانیەوە .بەرهەمی ئەو کۆششانەش بڵاوبوونەوەی بیرۆکەی مامەڵە ئیسلامیەکان –هەتا لەناو ئیسلامیەکانیشدا –کە هەتا سەردەمێکی نزیك زاراوەی وەکو: ( مشارکە ، مرابحە ، کفالە ، حوالە ) نەزانرابوون،لای کەمایەتیەکی پسپۆڕ نەبێت، کەس نەیدەناسین. ئینجا دەستی کرد بە راکێشانی سەرنج بەلای خۆیدا ، لە دووتوێی کارپێکردنی یا بەراوردکردنی –ئەوەی کە بیریی ئیسلامیی بناوانی رەسەنی خۆی هەیە ، بۆ چارەسەری هەندیّ لە گیروگرفتە ئابووریەکانی ئەم سەردەمە،وەکو گیروگرفتی هەڵئاوسانی ئابووری و، دۆزینەوەی ستراتیژیەتێکی جیاواز بۆ پەرەپێدان) [81]

---

[81] عبد الرحيم محمود حمدي ،تجربة البوك الاسلامية ،الاسلام فى السودان ،بحوث مختارة من المؤتمر الاول لجماعة الفكر والثقافة الاسلامية ،الخرطوم ٢٧-٣٠نوفمبر ١٩٨٢،دار الاصالة للصحافة والنشر ةالانتاج الاعلامى الخرطوم ١٩٨٧ص١٢٢

دەستەبەریی(چمان)ناکات بە توخمێکی یەکلاکەرەوە لە دیاریکردنی وەبەرهێنە هەڵبژاردەکانی (خیارات)، بەڵکو لە بەڕێوەبردنی کارەکانیدا ، دوو فرمانی بنەڕەتی دەگرێتەبەر ، یەکەمیان: زانیاریی‌و لێکۆڵینەوە لەسەر شیاوێتی ئەو کەسانەی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات ، بۆ ئەنجامدانی پڕۆژەکان . دووەمیش:خوێندنەوەیەکی تەواوی هەموو لایەنەکانی پڕۆژەکە ، بۆ دڵنیابوون لە سوودمەندیی‌و نەبوونی مەترسیی، بەپێی پێوەرە ئابووریی‌و هونەریی‌و داراییەکان . بانق بایەخی زیاتر دەدات بە لێکۆڵینەوەی وەبەرهێنەکانی‌و بەدواداچونیان و ، گرنگیی دەدات بەچاك جێبەجێکردنیان ، واتە -بانق -توانا هونەریەکانی خۆی دەخاتەکار ، بۆ خستنەکاری بەڕێوەبەرێتیەکی نویێ بۆ هاوبەشەکانی ، چونکە بەڕێوەبەرێتی خۆی رەگەزێکی زیندووە لە پرۆسەی پەرەپێداندا[85].

٦) لەکاتێکا دروشمی دامەزراوەکانی پەرەپێدانی جیهانیی و دەوڵەتە خۆرئاواییە کۆمەك بەخشەکان ، کورت دەکرێتەوە لە ( خستنەبەردەستی بەرهەمی پەرەپێدان بۆ هەژارترین کەرت لە هەژارترین وڵاتدا ). لەراستیدا بانقە ئیسلامیەکان پێشەنگ بوون لە ئاراستەکردنی ( تەمویل)ی بانقیدا ، بۆ فراوانترین بنکە کە جوتیاران و خێزانە هەژارەکانە لە لادێکاندا ، کە ماوەیەکی زۆربوو بێبەشبوون لەو کۆمەکانەی یارمەتیدەرن بۆ پەرەپێدانی کێڵگە بچوکەکان ، کە لەسەر شێوازی کۆن کاردەکەن ، ئەمەش -لەواقیعدا-بناغەی پەرەپێدانی دێهاتە لە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکاندا. تاقیکردنەوەی یەکێك لە بانقەکانی سودان گرنگیی رۆڵی بانقە ئیسلامیەکانی سەلماند ، بەوەی کە ئامێرێکی چالاکە لە سەرکەوتنی پەرەپێداندا ، ئەویش بانقی ئیسلامیی سودان بوو.

---

[85]هەمان سەرچاوە ل٢٠٩.

خاوەن سپاردەکان دەکشێنەوە و، روو لەکەرتی قازانجی خێرا (بازاڕی دراوەکان) دەکەن، کە هیچ بەرهەمێکی راستەقینە بۆ کۆمەڵگا زیاد ناکەن. [83]

٢) شێوازی ئیسلامیی پشت بە بیردۆزەیەکی بنەڕەتی دەبەستێت، ئەوە دەگەیێنێ: کاروتێکۆشانی مرۆڤ تەنها شتێکە،کە شیاوی پاداشتی دارایی بێت، سامان (پارە)بەتەنها لەڕووی شەرعەوە شایانی بەدەستهێنانی پاداشت نیە، ئەگەر کارێکی راستەقینەی لەگەڵدا نەبێت [84]،لە بانقی ئیسلامیدا بواری مامەڵە لەسەر بناغەی ( قەرزارو قەرزدەر) نیە ، بەڵکو پەیوەندیی کارێکی هاوبەشە ، کە هەرلایەنێك پابەندی بەرپرسیاریی خۆی دەبێت وبەرهەمی کارەکەی خۆی دەچنێتەوە ، قازانج بێت یان زیان.(نوێترین سەرژمێریی بانقە ئیسلامیەکانی سودان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە هاوبەشکاریی (المشارکات)زیاتر لە ٥٠٪ی کۆی وەبەرهێنانەکانە ، لەهەندێ بانقا دەگاتە ٦٠٪و ٧٠٪(وەکو بانقی ئیسلامیی سودان و بانقی هاوکاریی ئیسلامیی).

٣) بەتاقیکردنەوە سەلماوە کە (تەمویلی) چالاکیی ئابووری لە دووتوێی هاوبەشکاریدا(المشارکە)چالاکترە لە سەرکەوتنی پرۆژەکانداو ، دەستکەوتیشی زۆرترە لە هەندێ لە شێوازە ئیسلامیەکانیتر، وەکو (المرابحە).

٤) تاقیکردنەوە سەلماندویەتی کە دامەزراندنی بانقە ئیسلامیەکان –بەکردەوە– سامان و دەرامەتی زۆری پاشەکەوتکراوی کێشکردووە بۆ خولی ئابووری نوێ، ئەوانەی لەدەست ئەو کەسانەدا بووە کە خۆیان پاراستووە لە مامەڵە بە سوو.

٥) لەبەر ئەوەی بانقی ئیسلامیی سوو وەرناگرێت ، بۆ وەبەرهێنانی سامانەکانی پشت بە دەستکەوتی پرۆژەکە دەبەستێت ،لەبەر ئەوە کەفالەت و

---

[83] هەمان سەرچاوە ل١٧٩،

[84] هەمان سەرچاوە

دەستەبەریی(چمان)ناكات بە توخمێكی یەكلاكەرەوە لە دیاریكردنی وەبەرهێنە هەڵبژاردەكانی (خیارات)، بەڵكو لە بەڕێوەبردنی كارەكانیدا ، دوو فرمانی بنەڕەتی دەگرێتەبەر ، یەكەمیان: زانیاریی‌و لێكۆڵینەوە لەسەر شیاوێتی ئەو كەسانەی مامەڵەیان لەگەڵدا دەكات ، بۆ ئەنجامدانی پرۆژەكان . دووەمیش:خوێندنەوەیەكی تەواوی هەموو لایەنەكانی پرۆژەكە ، بۆ دڵنیابوون لە سوودمەندیی‌و نەبوونی مەترسیی، بەپێی پێوەرە ئابووریی‌و هونەریی‌و داراییەكان . بانق بایەخی زیاتر دەدات بە لێكۆڵینەوەی وەبەرهێنەكانی‌و بەدواداچونیان و ، گرنگیی دەدات بەچاك جێبەجێكردنیان ، واتە –بانق –توانا هونەریەكانی خۆی دەخاتەكار ، بۆ خستنەكاری بەڕێوەبەرێتیەكی نویێ بۆ هاوبەشەكانی ، چونكە بەڕێوەبەرێتی خۆی رەگەزێكی زیندووە لە پرۆسەی پەرەپێداندا[85].

٦) لەكاتێكا دروشمی دامەزراوەكانی پەرەپێدانی جیهانیی و دەوڵەتە خۆرئاواییە كۆمەك بەخشەكان ، كورت دەكرێتەوە لە ( خستنەبەردەستی بەرهەمی پەرەپێدان بۆ هەژارترین كەرت لە هەژارترین ولاٌتدا ). لەراستیدا بانقە ئیسلامیەكان پێشەنگ بوون لە ئاراستەكردنی ( تەمویل)ی بانقیدا ، بۆ فراوانترین بنكە كە جوتیاران و خێزانە هەژارەكانە لە لادێكاندا ، كە ماوەیەكی زۆربوو بێبەشبوون لەو كۆمەكانەی یارمەتیدەرن بۆ پەرەپێدانی كێڵگە بچوكەكان ، كە لەسەر شێوازی كۆن كاردەكەن ، ئەمەش –لەواقیعدا–بناغەی پەرەپێدانی دێهاتە لە ولاٌتە تازەپێگەیشتووەكاندا. تاقیكردنەوەی یەكێك لە بانقەكانی سودان گرنگیی رۆڵی بانقە ئیسلامیەكانی سەلماند ، بەوەی كە ئامێرێكی چالاكە لە سەركەوتنی پەرەپێداندا ، ئەویش بانقی ئیسلامیی سودان بوو.

---

[85] هەمان سەرچاوە ل٢٠٩.

خاوەن سپاردەکان دەکشێنەوە و، روو لەکەرتی قازانجی خێرا (بازاڕی دراوەکان) دەکەن، کە هیچ بەرهەمێکی راستەقینە بۆ کۆمەڵگا زیاد ناکەن. [83]

٢) شێوازی ئیسلامیی پشت بە بیردۆزەیەکی بنەڕەتی دەبەستێت، ئەوە دەگەێنێ: کاروتێکۆشانی مرۆڤ تەنها شتێکە،کە شیاوی پاداشتی دارایی بێت، سامان (پارە)بەتەنها لەڕووی شەرعەوە شایانی بەدەستهێنانی پاداشت نیە، ئەگەر کارێکی راستەقینەی لەگەڵدا نەبێت [84]،لە بانقی ئیسلامیدا بواری مامەڵە لەسەر بناغەی ( قەرزارو قەرزدەر) نیە ، بەڵکو پەیوەندیی کارێکی هاوبەشە ، کە هەرلایەنێك پابەندی بەرپرسیاریی خۆی دەبێت وبەرهەمی کارەکەی خۆی دەچنێتەوە ، قازانج بێت یان زیان.(نوێترین سەرژمێریی بانقە ئیسلامیەکانی سودان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە هاوبەشکاریی (المشارکات)زیاتر لە ٥٠٪ی کۆی وەبەرهێنانەکانە ، لەهەندێ بانقا دەگاتە ٦٠٪و ٧٠٪(وەکو بانقی ئیسلامیی سودان و بانقی هاوکاریی ئیسلامیی).

٣) بەتاقیکردنەوە سەلماوە کە (تەمویلی) چالاکیی ئابووری لە دووتوێی هاوبەشکاریدا(المشارکە)چالاکترە لە سەرکەوتنی پڕۆژەکانداو ، دەستکەوتیشی زۆرترە لە هەندێ لە شێوازە ئیسلامیەکانیتر، وەکو (المرابحە).

٤) تاقیکردنەوە سەلماندویەتی کە دامەزراندنی بانقە ئیسلامیەکان –بەکردەوە– سامان و دەرامەتی زۆری پاشەکەوتکراوی کێشکردووە بۆ خولی ئابووری نوێ، ئەوانەی لەدەست ئەو کەسانەدا بووە کە خۆیان پاراستووە لە مامەڵە بە سوو.

٥) لەبەر ئەوەی بانقی ئیسلامیی سوو وەرناگرێت ، بۆ وەبەرهێنانی سامانەکانی پشت بە دەستکەوتی پڕۆژەکە دەبەستێت ،لەبەر ئەوە کەفالەت و

---

[83] هەمان سەرچاوە ل١٧٩.

[84] هەمان سەرچاوە

تەکنۆلۆجیای گونجاو و، ورەی جوتیارەکەو خێزانە هەژارەکانیش بەرز دەکاتەوە ، هاورِێ لەگەڵ بایەخدانیان بە سەرکەوتنی پرِۆژەکە[87] بەوەی کە دادەنرێن بە هاوبەش نەك قەرزار ، سەرەرِای ئەو قازانجە زۆرەی ئەو هاوبەشیە بۆیان بەدی دەهێنێ ، ئەوە بە پێچەوانەی قەرزە کشتوکاڵیە کۆنەکانە، کە کۆڵی قورس کردبوون بە قەرزو سووەکانیەوە.

وا دەردەکەوێت دەست پێشخەریەکەی بانقی ئیسلامیی سودان، بە ئاراستەکردنی وەبەرهێنەکانی بۆ ناوچەرگەی دێهاتەکانی سودان ، دەستی خستۆتە سەر کلیلی راستەقینەی کێشەی پەرەپێدان لە ولاٍتانی جیهانی سێدا ، هەروەکو لیژنەی هونەریی هاوبەش لەنێوان پرۆگرامی نەتەوە یەککگرتووەکانی گەشەپێدان و، نوسینگەی کاری جیهانیی لە جنێف ILO/UNDP MISSION لە راپۆرتەکەیدا کە لەساڵی ١٩٧٦ ئامادەی کردبوو ، ئەوەی دەستنیشان کردووە بە ناونیشانی : ( گەشەو بەگەرِخستن و دادگەریی وەك ستراتیژیەتێکی گشتگیر بۆ سودان ) لەو راپۆرتەدا هاتووە کە : ( زۆربەی زۆری دانیشتوانی دێهاتەکان لە سودان و، زۆربەی ولاٌتانی تازەپێگەیشتوو ، لە بواری کشتوکاڵیی کۆندا کاردەکەن،یا بەشێوەیەك لە شێوەکان پشتی پێدەبەستن ، چالاکیە کشتوکاڵیەکانیان لەسەر پانتاییەکی بچوکە –لەنێوان دوو فدان تا هەشت فداندایە–شێوازێکی سەرەتایی لە کشتوکاڵدا بەکاردەهێنن ، کە پاڵپشتەکەی ئامێرە دەستیەکانە ، نەك ئامێرە نوێکان کە ماشێن کاری پێدەکات ، بەرهەمیشیان لە ئاستێکی زۆر نزمدایە..هەروەها داوودەرمانی مەگەزو کودی کیمیاوی بەکارناهێنن ، یا بەبرِێکی کەم بەکاری دەهێنن. ژمارەی ئەوانەی لەم کەرتەدا کاردەکەن لەسوٌدان دەگاتە ( دە )

---

[87] محمد عثمان خليفة ،المصدر نفسه ص١٧-٢٢

ئەو بانقە چالاکیەکانی لەشارە بازرگانیەکانەوە گواستەوە بۆ دێهاتەکان ، بۆ بەشداریکردن لە پەرەپێدانی یەکە بەرهەمهێنە کشتوکاڵیە بچوکەکان ، کە پانتاییان لە پێنج فدانەوە تا حەوت فدانە ، هەندێ جاریش لەوەش کەمترە . بەڕێوەبەرێتیەکی پسپۆڕ لە بانقا (بەڕێوەبەرێتی پەرەپێدانی دێهاتەکان) هەڵدەستێ بە خەرجیپێدانی (تەمویل)ی خاوەن زەویە بچوکەکان لەسەر بناغەی هاوبەش لەگەڵ جوتیارەکە ، یا ئەو خێزانەی خاوەنی زەویەکەن . هاوبەشیی بانقیش ، ئامادەکردنی ئامێرو کەرەسەو سەرمایەی پێویست و ، رێنمایی کشتوکاڵی و عەمارکردن و ناردنە بازاڕە،

لەکاتێکا هاوبەشیی جوتیارەکە ، زەویەکەیو ئیشەکەیو بەشێك لە خەرجیە (جاری)یەکەیە، ئەویش بەپێی تواناى .ئەو تاقیکردنەوەیە —لەگەڵ تازەییدا— قازانجێکی زۆری لەپێشا بۆ جوتیارەکەو لەدوای ئەو بۆ بانقیش بەدەست دەهێنا ، سەرەڕای بەشداریکردنی راستەقینەش لە زیاکردنی بەرهەم بە جۆرو بڕیشەوە ، لە ولاتێکی وەکو سوداندا ، کە داهاتی نەتەوەیی لە بنەرەتدا پشتی بەکەرتی کشتوکاڵیی بەستووە.

لێکۆڵینەوەیەکی بانقی ئیسلامیی سودانی[86] جەختی لەسەر ئەو ئەزمونە گرنگە کردۆتەوە، کە شێوازی هاوبەشیی ئیسلامیی لە (تەمویل)ی پرۆژە کشتوکاڵیەکاندا ، بریتیە لە ئالیەتێکی چالاك بۆ ئەنجامدانی پەرەپێدان ، لە ولاتە تازە پێگەیشتووەکاندا ، چونکە پێویستیە راستەقینەکانی کۆمەڵگای کشتوکاڵیی تەقلیدیی بەدەست دەهێنێ بە تێچویەکی کەم و ، بایەخ دەدات بە پێشخستنی

[86] ئەو توێژینەوەیە مامۆستا محەممەد عوسمان خەلیفە بەڕێوەبەری بانقی ئیسلامیی سودانیو دکتۆر سەلاحەدین شازلی ئیبراهیم، لە کۆلیژی ئابووری زانکۆی خەرتوم بە ئینگلیزی ئامادەیان کردووە بە ناونیشانی

The Sudanese Islamic Bank (SIB)
a.The experience of SIB in Musharaka Financing .
b.Musharaka financing as atool for development Intervention among small farmers ,Khartoum .july ,1988.

تەکنۆلۆجیای گونجاو و، ورەی جوتیارەکەو خێزانە هەژارەکانیش بەرز دەکاتەوە ، هاورێ لەگەڵ بایەخدانیان بە سەرکەوتنی پرۆژەکە[87] بەوەی کە دادەنرێن بە هاوبەش نەك قەرزار ، سەرەڕای ئەو قازانجە زۆرەی ئەو هاوبەشیە بۆیان بەدی دەهێنێ ، ئەوە بە پێچەوانەی قەرزە کشتوکاڵیە کۆنەکانە، کە کۆڵی قورس کردبوون بە قەرزو سووەکانیەوە.

وا دەردەکەوێت دەست پێشخەریەکەی بانقی ئیسلامیی سودان، بە ئاراستەکردنی وەبەرهێنەکانی بۆ ناوچەرگەی دێهاتەکانی سودان ، دەستی خستۆتە سەر کلیلی راستەقینەی کێشەی پەرەپێدان لە ولاتانی جیهانی سێدا ، هەروەکو لیژنەی هونەریی هاوبەش لەنێوان پرۆگرامی نەتەوە یەکگرتووەکانی گەشەپێدان و، نوسینگەی کاری جیهانیی لە جنێف ILO/UNDP MISSION لە راپۆرتەکەیدا کە لەساڵی ١٩٧٦ ئامادەی کردبوو ، ئەوەی دەستنیشان کردووە بە ناونیشانی : ( گەشەو بەگەڕخستن و دادگەریی وەك ستراتیژیەتێکی گشتگیر بۆ سودان ) لەو راپۆرتەدا هاتووە کە : ( زۆربەی زۆری دانیشتوانی دێهاتەکان لە سودان و، زۆربەی ولاتانی تازەپێگەیشتوو ، لە بواری کشتوکاڵیی کۆندا کاردەکەن،یا بەشێوەیەك لە شێوەکان پشتی پێدەبەستن ، چالاکیە کشتوکاڵیەکانیان لەسەر پانتاییەکی بچوکە –لەنێوان دوو فدان تا هەشت فداندایە– شێوازێکی سەرەتایی لە کشتوکاڵدا بەکاردەهێنن ، کە پاڵپشتەکەی ئامێرە دەستیەکانە ، نەك ئامێرە نوێکان کە ماشین کاری پێدەکات ، بەرهەمیشیان لە ئاستێکی زۆر نزمدایە..هەروەها داوودەرمانی مەگەزو کودی کیمیاوی بەکارناهێنن ، یا بەبڕێکی کەم بەکاری دەهێنن. ژمارەی ئەوانەی لەم کەرتەدا کاردەکەن لەسۆدان دەگاتە ( دە )

[87] محمد عثمان خليفة ،المصدر نفسه ص١٧-٢٣

ئەو بانقە چالاکیەکانی لەشارە بازرگانیەکانەوە گواستەوە بۆ دێهاتەکان ، بۆ بەشداریکردن لە پەرەپێدانی یەکە بەرهەمهێنە کشتوکاڵیە بچوکەکان ، کە پانتاییان لە پێنج فدانەوە تا حەوت فدانە ، هەندێ جاریش لەوەش کەمترە . بەڕێوەبەرێتیەکی پسپۆڕ لە بانقا (بەڕێوەبەرێتی پەرەپێدانی دێهاتەکان) هەڵدەستێ بە خەرجیپێدانی (تەمویل)ی خاوەن زەویە بچوکەکان لەسەر بناغەی هاوبەش لەگەڵ جوتیارەکە ، یا ئەو خێزانەی خاوەنی زەویەکەن . هاوبەشیی بانقیش ، ئامادەکردنی ئامێرو کەرەسەو سەرمایەی پێویست و ، رێنمایی کشتوکاڵی و عەمارکردن و ناردنە بازاڕە،

لەکاتێکا هاوبەشیی جوتیارەکە ، زەویەکەیو ئیشەکەیو بەشێك لە خەرجیە (جاری)یەکەیە، ئەویش بەپێی توانای .ئەو تاقیکردنەوەیە –لەگەڵ تازەییدا– قازانجێکی زۆری لەپێشا بۆ جوتیارەکەو لەدوای ئەو بۆ بانقیش بەدەست دەهێنا ، سەرەڕای بەشداریکردنی راستەقینەش لە زیاکردنی بەرهەم بە جۆرو بڕیشەوە ، لە وڵاتێکی وەکو سوداندا ، کە داهاتی نەتەوەیی لە بنەرەتدا پشتی بەکەرتی کشتوکاڵیی بەستووە.

لێکۆڵینەوەیەکی بانقی ئیسلامیی سودانی[86] جەختی لەسەر ئەو ئەزمونە گرنگە کردۆتەوە، کە شێوازی هاوبەشیی ئیسلامیی لە (تەمویل)ی پرۆژە کشتوکاڵیەکاندا ، بریتیە لە ئالیەتێکی چالاك بۆ ئەنجامدانی پەرەپێدان ، لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکاندا ، چونکە پێویستیە راستەقینەکانی کۆمەڵگای کشتوکاڵیی تەقلیدیی بەدەست دەهێنێ بە تێچویەکی کەم و ، بایەخ دەدات بە پێشخستنی

---

[86] ئەو توێژینەوەیە مامۆستا محەممەد عوسمان خەلیفە بەڕێوەبەری بانقی ئیسلامیی سودانیو دکتۆر سەلاحەدین شازلی ئیبراهیم، لە کۆلێژی ئابووری زانکۆی خەرتوم بە ئینگلیزی ئامادەیان کردووە بە ناونیشانی
The Sudanese Islamic Bank (SIB)
a.The experience of SIB in Musharaka Financing .
b.Musharaka financing as atool for development Intervention among small farmers ,Khartoum .july ,1988.

هەروەها دەرکەوتنی بانقە ئیسلامیەکان، هاوڕێیە لەگەڵ لەدایکبوونی کۆمپانیا ئیسلامیەکانی وەبەرهێنان به زۆر جۆری پسپۆڕیەوە ، له بواری بازرگانییو کارگوزارییو پەرەپێدانی کشتوکاڵییو خانوبەرەو دڵنیایی.هەروەها دامەزراوە کۆمەڵایەتییو فێرکاریەکان و دەستە خێرخوازیە ئیسلامیەکان ، کە کار لەبواری بانگەوازو ڕێنمایی تەندروستییو فێرکارییو ڕاگەیاندن و کاروباری ئافرەتاندا دەکەن.

مليۆن كەس ، كە دەكاتە مليۆنێك و دووسەد هەزار خێزان [88] ، لەدوای ئەوەش پیاهەڵدان و ڕێزلێنانی بانقی ئیسلامیی سودانی بۆ شێوازی هاوبەشیی ئیسلامیی و، دانانی بە ئالیەتێكی گەورە بۆ (تەمویل)ی كەرتە بەرهەمهێنەكان ، كە شایانی ئەوەیە بانقی ئیسلامیی لە سودان و غەیری سودانیش بە فراوانترین شێوە جێبەجێی بكەن. [89]

هەروەها بانقی فەیسەڵی ئیسلامیی لە سودان ، بڕێكی باش لە وەبەرهێنەكانی تایبەتكردووە بە كەرتەكانی كشتوكاڵ و پیشەسازیی و پیشە بچوكەكان، بە شێوەیەكی تایبەتیش –كەرتی پیشەوەرەكان–دابەشكردنی كەرتیی پرۆسە وەبەرهێنەكان كە بانق گرێبەستی لەگەڵ بەستوون لەماوەی ١٤٠٦-١٤٠٩ك ئاماژە بەوە دەكات كە وەبەرهێنەكان گەشەیەكی زۆر باشی كردووە ، وەكو ژمارەكان لەخوارەوە ڕوونی دەكەنەوە: [90]

| ساڵەكان | سەرجەمی‌وەبەرهێنان بانق بە میلیۆنەها جونەیە | وەبەرهێنانی‌پیشەسازی ملیۆنەها جونەیە | وەبەرهێنانی‌كشتوكاڵی ملیۆنەها جونەیە | پیشەوەرەكان ملیۆنەها جونەیە |
|---|---|---|---|---|
| ١٤٠٦ ك | ١٣٩,١ | ١٥,٠ | ٣٧,٣ | ٦,٧ |
| ١٤٠٧ | ١٩١,٨ | ٢٦,٣ | ٢٠,٨ | ١١,٠ |
| ١٤٠٨ | ٢٤٠,٩ | ٢٥,٣ | ٣٣,٨ | ١١,٩ |
| ١٤٠٩ | ٢٩٠,١ | ٣٧,٠ | ٣٦,٢ | ١٤,٣ |

(88) international labour office ,growth ,employment and equity,acomprehensive strategy for the Sudan ,Geneva,1976,pp.35-36

(89)محمد عثمان خليفة و الدكتور شاذلي ابراهيم ،مصدر سابق،ص٢١

(90)بنك الفيصل الاسلامي السوداني ،جدول رقم ٩ التوزيع القطاعي للعمليات الاستثمارية (١٩٧٩م-١٤٠٩ هجري)ادارة البحوث ،الخرطوم ،بلا تاريخ.

هەروەها دەرکەوتنی بانقە ئیسلامیەکان، هاوڕێیە لەگەڵ لەدایکبوونی کۆمپانیا ئیسلامیەکانی وەبەرهێنان به زۆر جۆری پسپۆڕیەوە ، لە بواری بازرگانیی‌و کارگوزاریی‌و پەرەپێدانی کشتوکاڵیی‌و خانوبەرەو دڵنیایی.هەروەها دامەزراوە کۆمەلآیەتیی‌و فێرکاریەکان و دەستە خێرخوازیە ئیسلامیەکان ، کە کار لەبواری بانگەوازو رێنمایی تەندروستیی‌و فێرکاریی‌و راگەیاندن و کاروباری ئافرەتاندا دەکەن.

ملیۆن کەس ، کە دەکاتە ملیۆنێك و دووسەد هەزار خێزان [88] ، لەدوای ئەوەش پیاهەڵدان و ڕێزلێنانی بانقی ئیسلامیی سودانی بۆ شێوازی هاوبەشیی ئیسلامیی و، دانانی بە ئالیەتێکی گەورە بۆ (تەمویل)ی کەرتە بەرهەمهێنەکان ، کە شایانی ئەوەیە بانقی ئیسلامیی لە سودان و غەیری سودانیش بە فراوانترین شێوە جێبەجێی بکەن. [89]

هەروەها بانقی فەیسەڵی ئیسلامیی لە سودان ، بڕێکی باش لە وەبەرهێنەکانی تایبەتکردووە بە کەرتەکانی کشتوکاڵ و پیشەسازیی و پیشە بچوکەکان، بە شێوەیەکی تایبەتیش -کەرتی پیشەوەرەکان-دابەشکردنی کەرتیی پرۆسە وەبەرهێنەکان کە بانق گرێبەستی لەگەڵ بەستوون لەماوەی ١٤٠٦-١٤٠٩ك ئامارە بەوە دەکات کە وەبەرهێنەکان گەشەیەکی زۆر باشی کردووە ، وەکو ژمارەکان لەخوارەوە روونی دەکەنەوە: [90]

| ساڵەکان | سەرجەمی‌وەبەرهێنان بانق بە میلیۆنەها جونەیە | وەبەرهێنانی‌پیشەسازی ملیۆنەها جونەیە | وەبەرهێنانی‌کشتوکاڵی ملیۆنەها جونەیە | پیشەوەرەکان ملیۆنەها جونەیە |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| ١٤٠٦ ك | ١٣٩,١ | ١٥,٠ | ٣٧,٣ | ٦,٧ |
| ١٤٠٧ | ١٩١,٨ | ٢٦,٣ | ٢٠,٨ | ١١,٠ |
| ١٤٠٨ | ٢٤٠,٩ | ٢٥,٣ | ٣٣,٨ | ١١,٩ |
| ١٤٠٩ | ٢٩٠,١ | ٣٧,٠ | ٣٦,٢ | ١٤,٣ |

---

(88) international labour office ,growth ,employment and equity,acomprehensive strategy for the Sudan ,Geneva,1976,pp.35-36

(89) محمد عثمان خليفة و الدكتور شاذلي ابراهيم ،مصدر سابق،ص٢١

(90) بنك الفيصل الاسلامي السوداني ،جدول رقم ٩ التوزيع القطاعي للعمليات الاستثمارية (١٩٧٩م-١٤٠٩ هجري)ادارة البحوث ،الخرطوم ،بلا تاريخ.

گومانی تێدانیە ئەوانە لە ((چارەسەری ئیسلامیانەدا ))نمونەیەك دەبینین كە شیاوی لێكۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنە ، هەتا ئەگەر پشتگیریی نەكرێت و جێبەجێش نەكرابێت .لەلایەكیتریشەوە ،دەبینین زانایەكی بەناوبانگی پایەبەرزی وەكو (كینیس جالبرێت)،هانی ولآتە پیشەسازیەكان دەدات ، كە قەرز بدەن بە ولآتە تازەپێگەیشتووەكان بە

مەرجی ئاسان ، واتە بە سووی نزم تا ئاستی سفر،یا نزمكردنەوەی تا ئاستێكی زۆر كەم و،ماوەی دانەوەشی درێژ بكەنەوە ، بەمەبەستی هاوكاریكردنی ولآتە هەژارەكان،دایشی بنێن بە كارێكی ئاسایی و سرووشتیی.[91]

لەواقیعدا ئەو بانگەوازە داننانێكی تێدایە بە شكستهێنانی سیاسەتی قەرزدانی سوودار لە (تەمویلی )پرۆژەكانی پەرەپێداندا ، بەلآم جالبێرت نەیخستۆتە ئەو چوارچێوەیەوە، لەباتی ئەوەی دان بنێت بە كاریگەریی سوو ، كە بەفیڕۆدانی – استنزاف–دەرامەتی میللەتە هەژارەكان و خرابتركردنی گیروگرفتی قەرزە دەرەكیەكان و ، روخاندنی هەوڵەكانی پەرەپێدانە لە ولآتە تازەپێگەیشتووەكاندا، ئەو زانا پایەبەرزە كوێرەوەریی گەلانی ولآتە تازەپێگەیشتووەكانی كردە بیانوو بۆ بانگەوازەكەی ، بۆ هەڵوەشاندنەوەی سوو لەسەر ئەو قەرزانەی دراوە بەو ولآتانە ، یا سووككردنی باریان، بەلآم دەركی ئەوەی نەكردووە كە سوو خۆی لەخۆیدا كاكڵەی گرفتەكەیە.

ئالێرەدا راستیی جیاوازی نێوان فەلسەفەی ئیسلام و سەرمایەداریی دەردەكەوێت ، ئیسلام سوو حەرام دەكات و رێگا دەدات بە وەبەرهێنانی سامان بە شەرعیی ، كە بواری ئەوەی تێدا نیە دەستكەوت بەبێ كاركردن بێتە دەست،بەلآم

---

[91] Galbraith ,EconomicdevelomentmOp.Cit,pp.53-54;this is one 93reason why lending between advanced countries and less advanced .at low or Zero rates of interest .. should be considered normal and natural.

## کۆتایی

----------

ئەوە بە کورتی هەندێ نیشانەدەری گرنگ بوو ،بۆ شتێك کە لەوانەیە ببێتە سەرەتای شۆڕشێکی ئابووریی ئاوەدانکاریی (عمران)گشتگیر ،کە پابەندبێت بە ئیسلامەوە ،وەکو بیروباوەڕو بەرنامەو رەفتارو،بەهرەمەندبێت لە بنەماکانی و بەهاکانیو ،لە روبوڕوبوونەوەی گرفتە ئابوورییو کۆمەڵایەتییو پەروەردەییو فیرکارییو رۆشنبیریەکانی کۆمەڵگا . بەلام ئەم راستیە ئەوە ناگەیێنێ چاو بنوقێنین ، لە ئاست سروشتی ئەو بەربەرەکانیە گەورانەی لە ئاسۆدا دەردەکەون ، کە پێویستیان بە تێکۆشانی زۆرو ئیجتهادو هاوکاریی هەرێمایەتیو نێودەوڵەتی لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلام و،نیشتمانی عەرەب و،دەوڵەتانی جیهانی سێو ،دەوڵەتە پیشەسازیەکان و،رێکخراوە نێودەوڵەتیەکان هەیە، پێش ئەوەی ئەزموونی ئیسلامیی رەهەندە جیهانیەکانی خۆی وەربگرێت ٬ بە دانانی بە چارەسەرێکی سەرکەوتوو و رەسەن ،بۆ گیروگرفتی پەرەپێدان لە جیهانی هاوچەرخدا.

ئەوەی هاندەری گەشبینیە ، ولاتانی تازەپێگەیشتوو ماوەیەکە دەناڵێنن بەدەست رژێمی ئابووریی نێودەوڵەتیەوە ، کە لەسەر (سوو) وسووککردنی هاوکێشە ( موازین) بازرگانیە جیهانیەکان وەستاوە، کە رووی پێکردۆتە رێگایەکی داخراوو ،وایلیێردووە هاواری

لێهەستاوە،دەڵێت:کۆمەکێکم ناوێت کە دەوڵەتە پیشەسازیە دەوڵەمەندەکان دەمدەنێ، چونکە دەرامەتەکانی دەخوات و، هەژاریی زیاترو پاشکۆیەتیم بۆ دروست دەکات. بەلام بازرگانیەکی دادگەرانەی بەلاوە باشترە ،دروشمی تازەی بریتیە لە Trde not Aid.

گومانی تێدانیە ئەوانە لە ((چارەسەری ئیسلامیانەدا ))نمونەیەك دەبینین کە شیاوی لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنە ، هەتا ئەگەر پشتگیریی نەکرێت و جێبەجێش نەکرابێت .لەلایەکیتریشەوە ،دەبینین زانایەکی بەناوبانگی پایەبەرزی وەکو (کینیس جالبرێت)،هانی ولاّتە پیشەسازیەکان دەدات ، کە قەرز بدەن بە ولاّتە تازەپێگەیشتووەکان بە

مەرجی ئاسان ، واتە بە سووی نزم تا ئاستی سفر،یا نزمکردنەوەی تا ئاستێکی زۆر کەم و،ماوەی دانەوەشی درێژ بکەنەوە ، بەمەبەستی هاوکاریکردنی ولاّتە هەژارەکان،دایشی بنێن بە کارێکی ئاسایی و سرووشتیی.[91]

لەواقیعدا ئەو بانگەوازە داننانێکی تێدایە بە شکستهێنانی سیاسەتی قەرزدانی سوودار لە (تەمویلی )پرۆژەکانی پەرەپێداندا ، بەلاّم جالبێرت نەیخستۆتە ئەو چوارچێوەیەوە، لەباتی ئەوەی دان بنێت بە کاریگەریی سوو ، کە بەفیرۆدانی – استنزاف–دەرامەتی میللەتە هەژارەکان و خراپترکردنی گیروگرفتی قەرزە دەرەکیەکان و ، روخاندنی هەوڵەکانی پەرەپێدانە لە ولاّتە تازەپێگەیشتووەکاندا، ئەو زانا پایەبەرزە کوێرەوەریی گەلانی ولاّتە تازەپێگەیشتووەکانی کردە بیانوو بۆ بانگەوازەکەی ، بۆ هەڵوەشاندنەوەی سوو لەسەر ئەو قەرزانەی دراوە بەو ولاّتانە ، یا سووککردنی باریان، بەلاّم دەرکی ئەوەی نەکردووە کە سوو خۆی لەخۆیدا کاکڵەی گرفتەکەیە.

ئالێرەدا راستیی جیاوازی نێوان فەلسەفەی ئیسلام و سەرمایەداریی دەردەکەوێت ، ئیسلام سوو حەرام دەکات و رێگا دەدات بە وەبەرهێنانی سامان بە شەرعیی ، کە بواری ئەوەی تێدا نیە دەستکەوت بەبیّ کارکردن بێتە دەست،بەلاّم

---

[91] Galbraith ,EconomicdevelomentmOp.Cit,pp.53-54;this is one 93reason why lending between advanced countries and less advanced .at low or Zero rates of interest .. should be considered normal and natural.

## کۆتایی

---------

ئەوە بە کورتی هەندێ نیشاندەری گرنگ بوو ،بۆ شتێك کە لەوانەیە ببێتە سەرەتای شۆڕشێکی ئابووریی ئاوەدانکاریی (عمران)گشتگیر ،کە پابەندبێت بە ئیسلامەوە ،وەکو بیروباوەڕو بەرنامەو رەفتارو،بەهرەمەندبێت لە بنەماکانی و بەهاکانیو ،لە روبوڕوبوونەوەی گرفتە ئابوورییو کۆمەلأیەتییو پەروەردەییو فیرکارییو رۆشنبیریەکانی کۆمەڵگا . بەلأم ئەم راستیە ئەوە ناگەێنێ چاو بنوقێنین ، لە ئاست سروشتی ئەو بەربەرەکانیە گەورانەی لە ئاسۆدا دەردەکەون ، کە پێویستیان بە تێکۆشانی زۆرو ئیجتهادو هاوکاریی هەرێمایەتیو نێودەوڵەتی لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلام و،نیشتمانی عەرەب و،دەوڵەتانی جیهانی سێو ،دەوڵەتە پیشەسازیەکان و،رێکخراوە نێودەوڵەتیەکان هەیە، پێش ئەوەی ئەزموونی ئیسلامیی رەهەندە جیهانیەکانی خۆی وەربگرێت ، بە دانانی بە چارەسەرێکی سەرکەوتوو و رەسەن ،بۆ گیروگرفتی پەرەپێدان لە جیهانی هاوچەرخدا.

ئەوەی هاندەری گەشبینیە ، ولأتانی تازەپێگەیشتوو ماوەیەکە دەناڵێنن بەدەست رژێمی ئابووریی نێودەوڵەتیەوە ، کە لەسەر (سوو) وسووککردنی هاوکێشە ( موازین) بازرگانیە جیهانیەکان وەستاوە، کە رووی پێکردۆتە رێگایەکی داخراوو ،وایلێردووە هاواری

لێهەستاوە،دەڵێت:کۆمەکێکم ناوێت کە دەوڵەتە پیشەسازیە دەوڵەمەندەکان دەمدەنێ، چونکە دەرامەتەکانی دەخوات و، هەژاریی زیاترو پاشکۆیەتیم بۆ دروست دەکات. بەلأم بازرگانیەکی دادگەرانەی بەلاوە باشترە ،دروشمی تازەی بریتیە لە .Trde not Aid

بەلأم (تەمویل)–لەگەڵ بایەخیدا –تەنها لایەنێکە لەلایەنەکانی کێشەکە،چونکە ئەنجامدانی پەرەپێدان –وەکو وتمان– نەبەستراوە بە تێکڕای کەڵەکەبوونی سەرمایەو زۆریی دەرامەت و ئاستی تەکنۆلۆژیو بەس ،بەڵکو بەپلەی یەکەم بەستراوە بە جیهانبنیی گشتگیرەوە کە لە بۆچوونیی ئیسلامدا گەیشتۆتە چڵەپۆپەی.

**تەواو بوو بە پشتیوانی خوای گەورە**

*******************

سەرمایەداریی ڕێگا دەدات بە بەدەستهێنانی دەستکەوت بەبێ کارکردن، لەکاتێکا پارەکەی لەکاری ڕاستەقینەی خۆی دووردەخاتەوە ، وەکو (ئامێری ئاڵوگۆڕ) سیفەتی سەرمایەی پێدەبەخشێت، ئینجا ئابووریناسە خۆرئاواییەکان سوویان پێناسەکرد بە: پاداشتی بەقەرزدراو یان وەبەرهاتوو.هەروەها کینز پێناسەی دەکات بە:پاداشتی قوربانیدان بە (سیولە)(92)بەڵام کینز جیاوازە لە ئابووریناسە تەقلیدیەکان،لەبارەی سروشتی نرخی سووەوەو ،ڕۆڵی لە بەدەستهێنانی هاوسەنگیی‌لە نێوان پاشەکەوت و قەبارەی وەبەرهێنان ، گەیشتە ئەوەی کە بەرزیی نرخی سوو ، لەو هۆکارانەیە کە هاندەرنیە بۆ وەبەرهێنان، خۆ ئەگەر نرخی سوو دابەزێت ، لەوانەیە بڕێکی زۆر لە وەبەرهێنان ئەنجام بدرێت لە چوارچێوەی ئەو دەستوورانەی کە باسی کرد(93)هەروەها وتویەتی :نەتوانینی دابەزاندنی نرخی سوو لەو هۆکارە گرنگانەیە کە بەردەوامیی دەدات بە بێبازاریی (ئاماژەیە بۆ بێبازارییەکەی ١٩٢٩-١٩٣٤).خۆ لەوانەیە ئەوەبێت هانی کینزی دابێت گەیشتبێتە ئەو باوەڕەی کە لەتوانادا هەیە ڕژێمێکی ئابووریی دابمەزرێت (کیفایەی حەددی)سەرمایەو نرخی سووی تێدا بگاتە ئاستی سفر).(94)

پوختەی قسەش ،ئەو ڕژێمە ئابوورییەی کە نرخی سووی تێدا نامێنێ، ئەوە ڕژێمی ئابووریی ئیسلامە ، بانقە ئیسلامیەکان دادەنرێن بە پێشەنگی ئەو ڕژێمە لەگەڵ کەمیی ئەزموونیان و تازەیی سەردەمیان.

---

(92) J.M.Keynes, The general theory ,etc,Collected writing of J.M.Keynes ,The Royal economic society,Cambridge U.Prss,1973Volpp,.167-175

(93)Stewart ,Op.Cit.pp,121.

(94)Stewert ,Op.Cit.pp.94-95and Alvin H.Hansen ,aguide to Keynes,Mc Graw –Hill Book Co.Inc .New York.1053,pp.157

بەڵام (تەمویل)–لەگەڵ بایەخیدا –تەنها لایەنێکە لەلایەنەکانی کێشەکە،چونکە ئەنجامدانی پەرەپێدان –وەکو وتمان– نەبەستراوە بە تێکڕای کەڵەکەبوونی سەرمایەو زۆریی دەرامەت و ئاستی تەکنۆلۆژیو بەس ،بەڵکو بەپلەی یەکەم بەستراوە بە جیهانبنیی گشتگیرەوە کە لە بۆچوونیی ئیسلامدا گەیشتۆتە چڵەپۆپەی.

**تەواو بوو بە پشتیوانی خوای گەورە**

*******************

سەرمایەداریی ڕێگا دەدات بە بەدەستهێنانی دەستکەوت بەبێ کارکردن، لەکاتێکا پارەکەی لەکاری ڕاستەقینەی خۆی دووردەخاتەوە ، وەکو (ئامێری ئاڵوگۆڕ) سیفەتی سەرمایەی پێدەبەخشێت، ئینجا ئابووریناسە خۆرئاواییەکان سوویان پێناسەکرد بە: پاداشتی بەقەرزدراو یان وەبەرهاتوو.هەروەها کینز پێناسەی دەکات بە:پاداشتی قوربانیدان بە (سیولە)(92)بەڵام کینز جیاوازە لە ئابووریناسە تەقلیدیەکان،لەبارەی سروشتی نرخی سووەوەو ،ڕۆڵی لە بەدەستهێنانی هاوسەنگییلە نێوان پاشەکەوت و قەبارەی وەبەرهێنان ، گەیشتە ئەوەی کە بەرزیی نرخی سوو ، لەو هۆکارانەیە کە هاندەرنیە بۆ وەبەرهێنان، خۆ ئەگەر نرخی سوو دابەزێت ، لەوانەیە بڕێکی زۆر لە وەبەرهێنان ئەنجام بدرێت لە چوارچێوەی ئەو دەستوورانەی کە باسی کرد(93)هەروەها وتویەتی :نەتوانینی دابەزاندنی نرخی سوو لەو هۆکارە گرنگانەیە کە بەردەوامیی دەدات بە بێبازاڕیی (ئاماژەیە بۆ بێبازاڕیەکەی ۱۹۲۹-۱۹۳٤).خۆ لەوانەیە ئەوەبێت هانی کینزی دابێت گەیشتبێتە ئەو باوەڕەی کە لەتوانادا هەیە ڕژێمێکی ئابووریی دابمەزرێت (کیفایەی حەددی)سەرمایەو نرخی سووی تێدا بگاتە ئاستی سفر).(94)

پوختەی قسەش ،ئەو ڕژێمە ئابووریەی کە نرخی سووی تێدا نامێنێ، ئەوە ڕژێمی ئابووریی ئیسلامە ، بانقە ئیسلامیەکان دادەنرێن بە پێشەنگی ئەو ڕژێمە لەگەڵ کەمیی ئەزموونیان و تازەیی سەردەمیان.

---

(92) J.M.Keynes, The general theory ,etc,Collected writing of J.M.Keynes ,The Royal economic society,Cambridge U.Prss,1973Volpp,.167-175

(93)Stewart ,Op.Cit.pp,121.

(94)Stewert ,Op.Cit.pp.94-95and Alvin H.Hansen ,aguide to Keynes,Mc Graw –Hill Book Co.Inc .New York.1053,pp.157

## سەرچاوە عەرەبیەکان


١)القران الكريم.

٢)ابراهيم احمد عمر :فلسفة التنمية ،رؤية اسلامية،المعهد العالمى للفكر الاسلامى ،مكتب خرطوم ط١ ١٩٨٩م.

٣)ابراهيم دسوقى اباظة :الاقتصا د الاسلامى ،مقوماتة ومنهاجه،مراجعة على عبدالواحد وافى ،دار الشعب،قصر العينى ،القاهرة ١٩٧٣م

٤)ابن خلدون :مقدمة ابن خلدون ،تحقيق على عبدالواحد وافى ،٤ اجزاء لجنة البيان العربى ط١ الجزئان الاول والثانى ،القاهرة ١٩٥٧م والجزئان الثالث والرابع١٩٦٠م

٥) الغزالى (ابو حامد): احياء علوم الدين،الجزء الثانى ،دار المعرفة للطباعة والنشر ،بيروت بغير تاريخ.

٦)اسماعيل صبرى عبدالله :نحو نظام اقتصادى عالمى جديد،الهيئة المصرية العامة للكتاب،القاهرة ١٩٧٧م.

٧)جورباتشوف (ميخائيل):البيرسترويكا ،ترجمة حمدى عبدالجواد ،دار الشروق،القاهرة ط١ ،١٩٨٨م

٨)عبدالحميد الغزالى :اساسيات المنهج الاسلامى فى التنمية الاقتصادية–مركز الاقتصاد الاسلامى ،المصرف الاسلامى الدولى للاستثمار والتنمية–ادارة البحوث–الرسالة للطباعة والنشر –القاهرة ١٩٨٨م

٩)عبدالله بن عبدالحمن :عارضة الاحوزى بشرح صحيح مسلم للامام ابن العربى المالكى ،دار الكتب العلمية ،بيروت –بغير تاريخ؟

١٠)فؤاد شندى :التنمية الاقتصادية فى الاسلام ،الاندلس للاعلام ،ط١،القاهرة ١٩٨٧م

١١)محمود ابو سعود :اثر تطبيق النظام الاقتصادى الاسلامى فى المجتمع ،جامعة الامام محمد بن سعود الاسلامية ،المجلس العلمى ،القسم الرابع ،الرياض ١٤٠٤ه

١٢)محمد عبدالمنعم عفر :نحو النظرية الاقتصادية فى الاسلام ،مطبوعات الاتحاد الدولى للبنوك الاسلامية١٩٨١م.

١٣)محمد على الصابونى :مختصر تفسير ابن كثير ،اختصار وتحقيق الصابونى ،دار القران الكريم ،ط٨،بيروت ١٩٨١ج٢.

١٤)ناجى معروف :اصالة الحضارة العربية،دار الثقافة ،بيروت ط٣,١٩٧٥م

# سەرچاوە عەرەبییەکان


١)القران الكريم.

٢)ابراهيم احمد عمر :فلسفة التنمية ،رؤية اسلامية،المعهد العالمى للفكر الاسلامى ،مكتب خرطوم ط١ ١٩٨٩م.

٣)ابراهيم دسوقى اباظة :الاقتصا د الاسلامى ،مقوماتة ومنهاجه،مراجعة على عبدالواحد وافى ،دار الشعب،قصر العينى ،القاهرة ١٩٧٣م

٤)ابن خلدون :مقدمة ابن خلدون ،تحقيق على عبدالواحد وافى ،٤ اجزاء لجنة البيان العربى ط١ الجزئان الاول والثانى ،القاهرة ١٩٥٧م والجزئان الثالث والرابع١٩٦٠م

٥) الغزالى (ابو حامد): احياء علوم الدين،الجزء الثانى ،دار المعرفة للطباعة والنشر ،بيروت بغير تاريخ.

٦)اسماعيل صبرى عبدالله :نحو نظام اقتصادى عالمى جديد،الهيئة المصرية العامة للكتاب،القاهرة ١٩٧٧م.

٧)جورباتشوف (ميخائيل):البيرسترويكا ،ترجمة حمدى عبدالجواد ،دار الشروق،القاهرة ط١ ،١٩٨٨م

٨)عبدالحميد الغزالى :اساسيات المنهج الاسلامى فى التنمية الاقتصادية–مركز الاقتصاد الاسلامى ،المصرف الاسلامى الدولى للاستثمار والتنمية–ادارة البحوث–الرسالة للطباعة والنشر –القاهرة ١٩٨٨م

٩)عبدالله بن عبدالحمن :عارضة الاحوزى بشرح صحيح مسلم للامام ابن العربى المالكى ،دار الكتب العلمية ،بيروت –بغير تاريخ؟

١٠)فؤاد شندى :التنمية الاقتصادية فى الاسلام ،الاندلس للاعلام ،ط١،القاهرة ١٩٨٧م

١١)محمود ابو سعود :اثر تطبيق النظام الاقتصادى الاسلامى فى المجتمع ،جامعة الامام محمد بن سعود الاسلامية ،المجلس العلمى ،القسم الرابع ،الرياض ١٤٠٤ه

١٢)محمد عبدالمنعم عفر :نحو النظرية الاقتصادية فى الاسلام ،مطبوعات الاتحاد الدولى للبنوك الاسلامية١٩٨١م.

١٣)محمد على الصابونى :مختصر تفسير ابن كثير ،اختصار وتحقيق الصابونى ،دار القران الكريم ،ط٨،بيروت ١٩٨١ج٢.

١٤)ناجى معروف :اصالة الحضارة العربية،دار الثقافة ،بيروت ط١٩٧٥م٣,

